# دیوانی شارەزا

(کەریم مستەفا حەوێزی)



هەولێر - کوردستان

چاپی یەکەم

# دیوانی شارەزا

( کەریم مستەفا حەوێزی )

لەسەر ئەرکی بنەماڵەی کەریم شارەزا چاپ کراوە

چاپی یەکەم ٢٠١٦

هەولێر - کوردستان

**کتێب: دیوانی شارەزا (کەریم مستەفا حەوێزی)**
**هەڵەچنی و سەرپەرشتی چاپ: کامەران کەریم شارەزا**
**تایپ: رەقیب عوسمان**
**دیزاین: سۆران عەبدلڕەحمان**
**مۆتیڤی بەرگ: محەمەد ئیسماعیل**
**بەرگ: عادل زرار**

**چاپخانەی شەهاب – هەولێر**

**چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠١٦**
**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی هەرێمی کوردستان**

**٤٣٤ ساڵی ٢٠١٦**

# پێشەکی

خوێنەرانی خۆشەویست، ئەوەی لەبەر دەستتان دایە تەواوی بەرهەمە شیعرییەکانی شاعیر و نووسەر کەریم شارەزای باوکمانە کە لە ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو دەست پێ دەکات تا ساڵی ٢٠١٣.

ڕاستە شارەزای باوکمان نزیکەی شەست ساڵی تەمەنی تەرخان کردبوو بۆ نووسین و لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی ئەدەبی و وەرگێڕان و ساغکردنەوەی ژیان و بەرهەمەکانی نووسەر و شاعیر و ناودارانی کورد و بیانی و چەندین بەرهەمی بە پێزی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە، و تەنانەت دەستێکی باڵای هەبووە لە دانان و ئامادەکردنی پڕۆگرامی خوێندن بۆ قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و بەشداری کردووە لە چەندین خولی زمانی کوردی بۆ مامۆستایان و فەرمانبەران بە مەبەستی ئاشنا بوونیان بە دارشتنی نووسراوی فەرمی فەرمانگەکان بە زمانی شیرینی کوردی لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، وە ماوەی ساڵێکیش بووە بە وانەبێژ لە بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین.

سەرقاڵ بوونی شارەزا بەم کارانە وای لێنەکردووە کە لایەنی شیعری فەرامۆش بکات بەڵکو هەر لە سەری بەردەوام بووە.

شارەزای باوك دوو بەرهەمی شیعری بڵاوکردۆتەوە یەکەمیان بەناوی (ئازادی و ژیان) لە ساڵی ١٩٦٠ و دیوانی (ڕێگەی دوور) لە ساڵی ١٩٧١، بەرهەمە شیعرییەکانی تری هەندێکیان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان پێشکەش کراون و هەندێکیانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان و پرۆگرامی خویندن بڵاوکراونەتەوە و هەندێکیشیان لەلایەن چەند هونەرمەندێکی ناوداری کورد وەك گۆرانی و سروود پێشکەش کراون وە ئەوانی تر وەك دەستنووس لە کتێبخانەکەی پارێزراون، ئێمەش بەباشمانزانی کە هەموو بەرهەمە شیعرییەکانی دوای کۆچی دوایی بۆ بڵاوبکەینەوە وەك ئەرکێکی بچووکی سەرشانمان ووامان بە باش زانی بەناوی (دیوانی شارەزا) بکەوێتە بەر دەستی خوێنەران و ئاشنایانی شیعری کوردی.

بە مەبەستی دەوڵەمەند بوونی دیوانە شیعرییەکە دەستنووسەکەمان خستە بەر دەستی دووکەسایەتی بەڕێز ئەوانیش مامۆستا (مومتاز حەیدەری) کە بەڕاستی ناوی پڕ بە پێستی کەسایەتیەکەیەتی و یەکێکە لە هاوڕێ و هاوخەمە (نایاب)ەکانی باوکمان کە لەکاتی نەخۆشی و پرسەی باوکمان بەردەوام هاوخەممان بوو، هەروەها خستمانە بەر دەست ئامۆزاو شاعیری

هەست ناسك (ئـازاد دڵـزار) كـە سـوودێكی زۆرمـان لـەسـەرنج و تێبینییەكانی وەرگرت و ڕێ نیشان دەرمان بوو بۆ بەچاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە.

وە لـە پێشـەكی دیوانەكـە نووسـینێكی بـە نرخـی (ئەحمـەد دڵـزار)ی مـامی گـەورەو بەقـەدرمان بـڵاو دەكەینـەوە بەناونیشانی **(كورتەیەك لە بیۆگرافیای كەریم شارەزای برام).**

لە كۆتایی دا دەڵێین هیچ بەرهەمێك بێ كـەم و كـوڕی نـابێ و دڵنیایین لەوەی گەر باوكمان لە ژیانی خۆی بە چاپی گەیاندبا زۆر لەمە نایاب تر دەردەچوو.

ئیتر چاوەڕوانی سەرنج و تێبینیەكانتانین...

(پشتیوان، كامەران، بارزان، سۆران، شیلان)

**كەریم شارەزا**

٢٠١٦/٥/٢٤

## به بۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر کۆچی دوایی کەریم شارەزای نەمردا

**بە پێنوسی:** ئەحمەد دڵزار

کەریم کوڕی مستەفا ئاغا کوڕی حەمەغای حەوێزیە لە ڕۆژی ١٩٢٨/٣/٤ لە شاری کۆیەی ئەدەب و هونەر و خەباتا، لە بنەماڵەیەکی ناسراو و هۆشیاردا لە دایك بووە زیت و زرنگ بووە.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هەر لە کۆیێ تەواو کردووە، لە پایزی ساڵی ١٩٤٦ دا چوو بۆ بەغدا لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ئەعزەمیە وەرگیراوە و لە سەرەتای هاونی ١٩٥٠ دا خوێندنی تەواو کردووە، هەروەها لە هەمان ساڵیشدا لە قوتابخانەی یەکەمی کۆیە دامەزراوە.

لە ساڵی ١٩٦١ پاش یانزە ساڵ خزمەت لەسەر هەڵوێستی سیاسی بۆ پارێزگاری زیقار (ناسریە) دوورخراوەتەوە و لە گوندێکی نزیك (شەترە) دەکرێتە مامۆستای زمانی عەرەبی و منداڵانی عەرەب فێرە زمانی عەرەبی دەکات، لەمەش زیاتر لە ١٩٦٤/١١/٧ تەنسیب کراوە بۆ دواناوەندی (شەترە) بۆ گووتنەوەی زمانی عەرەبی لە پۆلی سێی ناوەندیدا.

لە پاییزی ساڵی ١٩٦٦ گواسترایەوە بۆ پارێزگای هەولێر، دوو ساڵ لە مەخموور بوو، لە پاییزی ساڵی ١٩٦٨یش گوێزرایەوە بۆ ناو شاری هەولێر، لە قوتابخانەی سەرەتایی نموونەیی هەولێر کرا بە مامۆستای زمانی کوردی و عەرەبی.

دوای بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ کرا بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کۆڕەکی سەرەتایی لە شاری هەولێر و دوای ساڵێك گوازرایەوەو کرا بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەڵگوردی سەرەتایی کوڕان کە خوێندن تێیدا بە زمانی عەرەبی بوو، لەسەر داوای کەریم و بە فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر خوێندنەکەی کرا بە زمانی کوردی... لە ئەنجامیشدا دوای بیست ساڵ مامۆستایی و دوای دوانزە ساڵیش بەڕێوەبەرایەتی لە ساڵی ١٩٨٢ خۆی خانەنشین کردووە.

لە شوباتی ١٩٧٠ لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد بۆتە ئەندام لە لقی هەولێر و لە دەستەی دامەزرێنەرانی یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی هەولێر بووە.

لە کۆنفرانسی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر بە سکرتێری دەستەی بەڕێوەبەرایەتی هەڵبژێردراوە و لە ساڵی ١٩٧٨ تا ١٩٨٣ دوو جار سەرۆکی لقی هەولێری یەکێتی نووسەران بووە.

لە هەموو کۆنگرەو سیمینار و میهرەجانەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد بەشداربووە.

لە پاییزی ساڵی ١٩٧٣ دا بە ئەندامی یاریدەدەری (کۆڕی زانیاری کورد) لە بەغدا هەڵبژێردراوە.

لە ساڵی ١٩٩٧یش دوای دامەزراندنی ئەکادیمیای کوردستان بە ئەندامی یاریدەدەری ئەو ئەکادیمیایە هەڵبژێردراوە.

لە سەرەتای دەستبەکاربوونی پەرلەمانی کوردستانەوە تا کۆتایی ساڵی ٢٠١٣ کاری وەرگێڕانی یاساو بڕیارەکانی پەرلەمانی کوردستانی کردووە.

کەریم شارەزا نووسەرێکی شارەزاو نموونەیی بووە، لە نووسینی کوردی و عەرەبیدا درێژدادڕ نەبووە، هەر نووسینێکی بنووسیبایە بە تێر و پڕی ئەجامی دەدا، هیچ بەڵگەیەکی بەبێ ژێدەری باوەڕپێکراو نەنووسیوە.

ئێستا ١٧ بەرهەمی چاپکراوی هەیە جگە لە چوار بەهەم و کۆمەڵێك لە شیعر کە بۆ چاپکردن ئامادەکراون. کەریم شارەزا لە ٢٠١٥/٥/٢٣ کۆچی دوایی کرد، ٨٧ساڵ ژیا.

**تەمەن هەرچەند درێژبێ کورتە بەخوا**
**وەکو خەونێکە خێرا دێت و دەڕوا**

دیاردەی مەرگ و ژین دیاردەییێکی دیاری ڕۆژانەیەو، هەر کەسێ بێتە دنیای ژیانەوە ڕۆژێك دێ لێی دەرچێ ئەمە هەروایەو هەرواش دەبێ، تا ئەم ئەستێرە شینەی ئێمە کە تۆپی زەوییە بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە.

حاجی قادری کۆییش راستی فەرمووە:

**مەرگ و ژین مسلی سێبەر و تاوە**
**ئەوەی باقی بمێنێ هەر ناوە**

ناوی کەریم شارەزای نەمریش تا زمانی شیرینی کوردی و ئەدەبیاتی کوردی بمێنێ هەر دەمێن ێ هەزاران درووود و سڵاو لە گیانی پاکی کەریم شارەزا.

هەولێر ٢٠١٦/٥/٢١
دڵزار

## شارەزای قەڵەم
## قوتابخانەیەکی کلتووری هەمەڕەنگ

**نووسینی:** مومتاز حەیدەری

**بەرایی: پێشەکی:**

من لە سەرەتای حەفتاکانەوە، هەوڵی ئەوەم داوە، کە مرۆڤە گەورەکان، بە بۆنەی ساڵی لە دایك بوونییانەوە، ڕێزی شایستەیان لێ بگیرێ، جا لەم ڕووەوە جا لەو ساوە، بە پێی توانا، لە بارەی هەندێ ئەو کەڵە مرۆیانەی کوردستان، نووسیەو پێشنیازم، لە پێناو ئەوەی ڕێزی تایبەتییان لێ بگیرێ، بۆ نموونە: (شاعیری نیشتیمان پەروەر ڕەمزی مەلا مارف، پێشنیازەکە جێ بە جێ کرا)، گەورە نووسەری کورد مامۆستای عەلائەددین سجادی، بەداخەوە جێ بە جێ نەکرا، تێکۆشەری ناسراوی کوردستان کاك عەزیز محەمەد، تێکۆشەرو شارعیری گەلەکەمان مامۆستا دڵزار، تێکۆشەری ناوداری کورد کاك کەریم ئەحمەد، جەنابی مام جەلال، پ.د.جەمال نەبەز، هەتا دەگاتە نووسرەو ڕووناکبیری ناسراو مامۆستا کەریم مستەفا شارەزا، کە ڕێکەوتی "٢٠١٥/٥/٢٣" کۆچی دوایی کرد...) جا بە بۆنەی دەرچوونی کۆ بەرهەمی شیعری مامۆستا شارەزا، کە بنەماڵەی کۆچ

کردووی نەمر، داوایان کرد، کە پێشەکییەکەی بۆ ئەم کۆ بەرهەمی شیعرەکانی بنووسم، کە لێرەدا بەگەرمی سوپاسییان دەکەم، ئەو شەرەفەیان بە من بەخشی... بۆیە منیش هەر لێرەدا حەز دەکەم ئەو چەند دێرەی کە لە ژمارەیەکی گۆڤاری K21 لەبارەی ئەو گەورە نووسەر و شاعیر و لێکۆڵەرەوە، کە لە ژیاندا بوو، نووسیبووم، دووبارە، لە بەرای ئەم پیشەکییەدا بڵاوبکرێتەوە:

**دەقی نووسینەکە:**

٨٠ ساڵەی لە دایك بوونی نووسەر و ڕووناکبیری ناسراو مامۆستا کەریم شارەزا شکۆداربێت.

ڕێکەوتی ٢٠٠٨/٣/٤، مامۆستا کەریم شارەزا، (٨٠) ساڵی خشت لە تەمەنی پڕ کۆشش و چالاکی پەروەردەیی و کلتووری نەتەوەیی پێشکەوتنخواز تەواوی کرد... ئێمەش هەر لێرەوە زۆر بە گەرمی چەپکە گوڵی پیرۆزبایی بە نووسەر و ڕووناکبیری ناسراوی کوردستان، مامۆستا کەریم شارەزا پێشکەش دەکەین، ئومێد دەکەین مامۆستای گەورەمان هەردەم لەش ساغ تەمەن درێژ بێت. ڕەوشی کلتووری نەتەوەیی و هاوچەرخ زیاتر دەوڵەمەندی بکات.

هەر بەم بۆنەیەوە، ژیاننامەی مامۆستا کەریم وەك وەفاو پێزانین پێشکەش بە نەوەی نوێ دەکەین.

هیوامان وایە، وەك سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندی باوەڕپێكراو لە مەیدانی نووسینی كلتووریدا سوود بەخش بێت... جارێكی دیكەش پیرۆزبایی و ئومێدی لەش ساغ و تەمەنی درێژی بۆ دەخوازین...

دیارە، نووسین خۆی لە خۆیدا، بە گشتی كارێكی هزری و مرۆڤپەروەریی قورسە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی خاوەنی قەڵەمی نیشتمانی، نەتەوەیی، ڕاستگۆن، لەوەش قورستر، كە بیانەوێ لەبارەی  خاوەن قەڵەمێكی گەورە شتێ بنووسن...! بۆیە كە بۆ من زەحمەتێكی گەورەیە، لەم دەرفەتە چەند لاپەڕییەدا، بە بۆینەی چاپ كردنی ئەم كۆبەرهەمە شتێ بنووسم، چونكە مامۆستا كەریم، زیاتر لە (٦٠)ساڵ خەریكی نووسین و شیعر و لێكۆڵینەوەو فەرهەنگی هەمە چەشنی كلتووری بووەو بەسەدان وتار و دەقی شیعر و لێكۆڵێنەوەی كلتووری فرە بابەتی: ئەدەبی، هونەری، فۆلكلۆری، مێژوویی، كۆمەڵایەتی، نەتەوەیی، وەرگێڕان...هتد..! بەرهەم هێناوە.

هەڵبەت سەرەڕای ئەو بابەتە هەرە زۆر و هەمەچەشنانە، كە لە ژمارەیەكی زۆری گۆڤار و ڕۆژنامەكانی كوردستان، هەر لە گۆڤاری هەتاوی مامۆستا گیوی موكریانی پەنجاكانی سەدەی ڕابردوو، تا دەگاتە بەر لە كۆچی دوایی ناوەختەكەی، كە هێشتا بەو تەمەنە شكۆدارەی توانای نووسین و گفتوگۆی بەردەوام بوو...

هاوکات خاوەن ئەم قەڵەمە زێڕینە، مامۆستایەکی پەروەردەیی کارامە و بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتووی زیاتر لە (٣٠) سی ساڵ بوو.. جا بۆ من، لێرەدازۆر زەحمەتە، لەبارەی گەورەیی ناوەڕۆکی ئەم کۆبەرهەمە شرۆڤە بکرێ و بنووسرێت، لەبەر ئەوەی ئەم کۆبەرهەمەی شیعر، کە لە نۆ بەش، بگرە نۆ دیوان، پێك هاتووە...!؟ جا ئەم کتێبە گەورەیە، بە هیچ جۆرێ لێرەدا ناکرێ، بە پەلەو کورتیش بێت، لەبارەیەوە نانووسرێ، بەڵکو دەبێ پاش دەرچوونی نووسەر و ڕەخنەگرانی ئەدەبی، بەشێوەیەکی زانستی و پشوو درێژی لێکۆڵینەوە، بنووسن، بە نەوەی نوێ پێشکەش بکرێ.. لەلایەکی دیکەوە، شرۆڤە و نووسین لەبارەی شیعرەوە، کارێکی ئاسان نییە، ئەوە پسپۆڕی خۆی گەرەکە، چونکە هەر وەکو دەگوترێ، شیعر ژیانە، گیانی ڕۆمانسیەتی ژیانیش شیعرە، واتە،شیعر بە شێکی ڕۆحی مرۆڤایەتییە بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە.

دیارە مامۆستا شارەزاش، یەکەم هەنگاوی بە شیعر دەست پێ دەکا، ئەویش لە پێناو ژیانێکی نوێ، بگرە لە پێناو جوانی ژیان، ئازادیی ژیان، شیعر دەکاتە ئامرازێکی خەبات... هتد.

لە کۆتاییدا، زێدە بەکورتی دەڵێم، چ لەبارەی ئەم کۆبەرهەمە شیعریە، یان، لەبارەی ڕەوسە گەورەکەی شارەزای قەڵەم، کە

لـەماوەی زیـاتر لـە (٦٠) سـاڵ، بـە خـەزنـەیـەکی مـەزنی کلتـووری کوردان دەژمێردرێ، قەڵـەمەکەش دەوەستـێ....!؟

بـەهـەرحاڵ من داواکارم، لـە بنامـەڵـەی کۆچ کردووی نـەمر، هـەوڵ بدەن تێکرایی نووسین و لێکۆلینـەوەکانـی بە کتێبـەکانییەوە، وەکو پڕۆژەیـەکی گـەورەی کلتـووری، هـەر هـەمووی بەسـەر یەکـەوە، ئامادەی بکەن، وە بە چاپێکی قەشەنگ چاپ بکرێ... هاوکات پێش ئەنجامدانی ئەو کارە کلتوورییە، بە چاپ گەیاندنی، ئەلقەیەکی لێکۆڵینەوەی زانستی لەبارەی بەرهەمەکانی مامۆستا شارەزا جێ بەجێ بکرێ... بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکان لەگەڵ کۆبەرهەمەکانی مامۆستا بڵاو بکرێتەوە... ئەوە، بەهەر دووکییان، ((کۆ بەرهەم + لێکۆڵینەوەکان)) دەبنە سەرچاوەیەکی گەورەی دەوڵەمەندی کلتووری، کە کەلێنێکی مەزن لە کتێبخانەی کوردی بەگشتی و لە سەر ئاستی خوێندنی زانکۆیی بەتایبەت دەگرێتەوە.

بـەهیوای ئـاوات و پێشـنیازەکەم، وەکـو ڕێـز لێنـانێکی کلتـووری، نەتەوەیی، بۆ مامۆستا شارەزا جێ بەجێ بکرێ. سوپاس بۆ هەموو لایەك

هەولێر- کوردستان

٢٠١٦/٤/١٠

# چەند قسەیەک

**نووسینی:** ئازاد دڵزار

کە بۆ مەبەستی چاپکردنیان ئەو کۆمەڵە شیعرانەیان خستە بەردەستم ماوەیەك دامام و هۆشم فڕی، ئەو ڕۆژەی پاییزی ساڵی ١٩٥٥ی سەدەی ڕابردووم بیر کەوتەوە کە مامم (شارەزا) لە کۆیێ دەستی گرتم و بردمییە مەکتەبی (ئولا)ی سەرەتایی کوڕان لەگەڵ خوا لێخۆشبووان مامۆستا (جەلال حەوێزی) و (مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی) لەبەردەم تەختە ڕەشێدا تاقیان کردمەوە لە بیرمە مامۆستا جەلال حەوێزی کە بەڕێوەبەری مەکتەبێ بوو فەرمووی: بنووسە (٢٣) منیش نووسیم (٢٠) دوایی (٣) واتا نووسیم (٢٠٣) ئەویش لە ژێر عەینەکەکەیەوە بە دوو چاوە گەورەکانییەوە بە ڕوێکی بەسام و بەبێ هیچ ئاسەواری زەردەخەنەیەکەوە لێم ڕامابوو مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزیش بە بەژنێکی دامەزراو و پەیکەرێکی بەخۆوەوە ڕاوەستابوو من لە ترسان هەترەشم چوو بوو، هەندێ وشەیان لەسەر تەختەی پێ نووسیم وا دیار بوو بڕیاریان دا کە لە پۆلی دووەم لە خوێندنێ بەردەوام بم، تا پۆلی شەشەمی بەراییشم تەواوکرد مامۆستا (شارەزا) لەو مەکتەبەیەدا دەرسی پێ گوتوم.

ئەو دەمای کە مامم (شارەزا) پەلی گرتم و منی بردە مەکتەبێ تازە ماڵمان لە کەرکوکێ کەوتبۆ دەستی پۆلیسان و ئاشکرا ببوین چونکە ئێمە لەوێدا بە نهێنی دەژیاین و بابم کاری حیزبایەتی دەکرد، گەڕاینەوە کۆیێ بابم قوتاری ببوو ئێمەش لەگەڵ ماڵی مامدا لە خانوویەکی گەورەو فراواندا کە لە مەڕ باپیرم بوو

بەیەکەوە دەژیایین و هەر لە مەنجەڵێکیشدا دەمانخوارد، ئەو دەمای من ساڵێك پیشتر لە (سولەیمانییێ) بە پێناسی منداڵێکی تر هەندێکم لە مەکتەبێ خوێندبوو ئەو دەمای هەر بە (ڕەزا عەلی) بانگیان دەکردم، تا ساڵی ١٩٦١ کە مامم (شارەزا) بە نەقڵی ئیداری کارەکەی کە مامۆستای بەرایی بوو گوێزرایەوە بۆ قەزای (شطرة) لە پارێزگای (ناصرية)ی باشووری عێراقێ ئیتر لێك جیابووینەوە، لە دوای چەندین ساڵان هەردوو لامان کەوتینە هەولێرێ، کە لە هەولێریش دەمخوێند مام دەستگرۆیی دەکردم.

دواتر کە زاندرا منیش حەزێکی شیعر و ئەدەبیاتم هەیە پتر لەگەڵ مامدا لێك نزیك کەوتینەوە لە هەندێك کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیدا بە یەکەوە دەبیندراین هەندێ برادەر بە تەعلیق پێیان دەگوتین (مام و برازا پیرخەنی)، لە ڕاستی دا خۆشەویستی ئەدەب و خوێندنەوە پتر لێکی نزیك خستبووینەوە.

ئەوەندەی من ئەو پیاوەم لە نزیکەوە ناسی خاوەن زانیارییەکی مەوسوعی فراوان بوو، شارەزاییەکی باشی لە مێژووی نوێ و ئیسلامەتیدا هەبوو، لە زمانی عارەبی و ئەدەبی عەرەبی سەردەمی جاهیلی و ئیسلامدا بەڵەد بوو لێکۆڵەر و ڕەخنەگرێکی وردو بە سەلیقەبوو هەڵپەی خۆ هەڵواسینی نەبوو بەملاو ئەولادا ئەگەر ئەوەی بکردبایە بای ئەوەندەی پێ بوو کورسێکی باشتر بۆ خۆی بگرێ، هەر کارێکی لە دەست هاتبا گەر خەڵك داوایان لێکردبا بۆی دەکردن، خاکە ڕاو بە بەشێکی کەم قایل بوو بە کورتی پیاوێکی (زاهید) بوو.

دەکرێ منیش وەك خەڵکی تر ڕای خۆم هەبێ لەسەر شیعرەکانی ڕەنگبێ ئەو ڕایانە لای خەڵکی تر بە پێچەوانە بکەونەوە بە هەر حاڵ من پێم وایە جوانترین شیعرەکانی مامۆستا (شارەزا) ئەو شیعرانەن کە لە ساڵانی پەنجایەکانی سەدەی

ڕابردوو دا گوتوونی و ڕادەی شاعیرییەتی لە شاعیرانی سەردەمی خۆی کەمتر نییە سۆز و سوتان و ڕیتم و بریسکانەوەی شعیریان بە تەواوەتی تێدا بەرجەستەیە بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کە کراونەتە سرود و گۆرانی لە سەردەمی خۆیدا کەلێنێکی گەورەیان پڕ کردۆتەوە.
زۆر بەی ئەو شیعرانەش لە هەردوو کۆمەلە شیعری چاپکراویدا دەبیندرێن:

١ -ئازادی و ژیان (١٩٦٠) چاپخانەی وەفا بەغدا.
٢ -ڕێگەی دوور ١٩٧١ مطبعة النعمان، النجف الاشرف.

بەلام لە دوای شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨وە هەست دەکرێ درەوشانەوەی شیعری لە شیعرەکانیدا دەدەنە کزی. بەڵام هەر لە دوای ئەو مێژوەشەوە چەندین شیعری جوان لە کۆمەڵە شیعری (ئازاد و ژیان) بەرچاو دەکەون وەك: (تۆ ١٩٦٠، هێزی گەل ١٩٥٨، دوو ڕوو ١٩٦٠)، هەروەها لە کۆمەڵە شیعری (ڕێگەی دوور)یشدا لە دوای شۆڕشی تەمموز، چەند شیعری تری جوان دەبیندرێن وەك: (جەژن ١٩٦٢، نامەیەك لە شەطرەوە ١٩٦٢، شیوەن بۆ کەمال ١٩٦٣، بەهارم ڕۆ ١٩٦٩، ڤییەتکۆنگ ١٩٧٠، من و تۆ ١٩٧٠، شیوەنی بیلال ١٩٧٠).

لەکۆمەڵە شیعری (یادگاری کۆن)یشدا هەمان بریسکانەوەی شیعری دەبیندرێ کە ئەو شیعرانەش بە زۆری ئی سالانی پەنجایەکانی سەدەی ڕابردوون، وەك: (سروودی شاری کۆیە ١٩٥٧)، قوڵەی ڕانیە ١٩٥٥)، (یارەکەی شوخ و شەنگم ١٩٥٥)، (کەوی ئازادی ١٩٥٨).

زۆربەی ئەو شیعرانەی کە بۆ سیاسەت نووسراون ڕێنمایی کردن و هەستی دڵسۆزی دەربڕینن بەرامبەر گەل و نیشتمان بەلای منەوە

کارەبای شیعریان کزن، بە کورتی رای من وایە مامۆستا شارەزا لە ساڵانی پەنجایەکانی سەدەی ڕابردوودا یەکێك بووە لە شاعیرە لێهاتووەکانی کورد بەم دواییەش ببو بە خاوەن ڕایەکی پێگەیشتوو قەڵەمێکی بە بڕشت و لە توێژینەوە و دیراسەت و ڕەخنەو چوونە پنج و بناوانی ڕووداوە مێژووییەکان و کەسایەتییە نیشتمان پەروەرەکاندا قەڵەمێکی کارامە و کەم هاوتابوو.

ئازاد دڵزار

١ی ئایاری ٢٠١٦ هەولێر

## پێشەکی

**نووسینی عبدالرزاق محمد (بیمار)**

**ســـــوپاس شکســـــتەو پەڕاگەنـــــدەی شــــەو**
**ڕائـــــەکا لـــــە پـــــێش قشـــــوونی پڕتـــــەو!**

***

**خـــــۆر شـــــەبەقی دا بـــــە ڕەنگـــــی پـــــاکی**
**تـــــاریکی بەزانـــــد بـــــەهۆی ڕوونـــــاکی!**

***

زەردەشت کە لە هەرێمی بەرمی (ورمی) لەسەرتای سەدەی شەشەمی (بەر لە زایین) ئاینی زەردەشتی خستە ناو دڵی خەڵکەوە، لەسەر ئەو باوەڕە کە دنیا هەمووی کێشەو راکێشکێ یە لە نێوان هێزی پاك، یا هێزی ڕووناکی کە خوای هورمز سەرکردەیەتی، لەگەڵ هێزی پیس و بەد کە هێزی تاریکی یەو ئەهریمەن سەرکردەیەتی.

بەر لە ئەو و تا ئیمرۆش بێگومان لە دەروون و دڵماندا، لە دنیادا، لە ژیاندا هەردوو هێزن کە ڕووناکی و تارکی دورشمیانن کەوتوونەتە ململانێ، هورمز، خوای ڕووناکی، وەکو زەردەشت ئەڵێ:

شەش یاریدەدەر بەردەستییان کردووە، هەر ئەمانە نەبوون و بەس، بەڵکو لە ناو مەردا، لە پاشاو وەزیر و سەرباز و خاوەن بیرو بۆێژ و گوانیبێژ و هونەروەر و هەموو چەشنە چاکە کەری کە بەردەستیان کردوو و لە لەشکرگاهی ڕووناکی... تۆوی چاکەو ڕووناکی و شادی و گوڵاوو تێرییان لەسەر ئەم زەمینەدا بو کردۆتەوە!

هەروەها ئەهریمەنیش خۆی شەش دیڤ، یا دێوەکانی نەبوون بە تەنیا، بەڵکو لەشکرگاهەکەی لە سەرەتای زەمینەوە تاکو ئەمڕۆ پڕ بووە لە وانەی ژەهری خراپەکاری و لێقاوی ڕەشی تاریکی و بیری بەدیان تێکەڵ بە نانی خەڵکەکە کردووەو بەری ڕەنجی زۆربەی تێکۆشەرانیان مژ تووە وەکو مێردەزمە سواری بیرو هۆشیان بوون.

ئەوساش و ئیمڕۆش هەر بەر بەرەکانییە لە نێوان ڕووناکی و تاریکی دا، لە نێوان ئەوانەی حەز ئەکەن (گەرمایی و ڕووناکی تر بدەنە بەر تیشکی ڕۆژ) و وەکو زەردەشت فەرمانی داوە (بیری چاك، کردەوەی چاك و وتەی چاك) لەگەڵ سەربازانی بەرەی ڕووناکی بەکرێکار و جووتیار و ئیشکەران و خوێندەوارانەوە، بەڵکو هەموو خەلك ڕەفتار بکەن... لەگەڵ ئەوانەی حەز ئەکەن تیشکی ڕۆژ و پیت و گەرمبوونەوە لە مەردم قەدەغە بکەن و لە تاریکی نەزانی و خەوتنا بیان کرن..بیان مژن... بیان فرۆشن.

ئێمڕۆ لە هەموو ڕۆژی زیاتر بەر بەرەکانی کەمترە لە نیوان هێزی ڕووناکی کە ئاشتی خواز و داواکەرانی ئازادی هەموو مرۆڤێکن و پشتگیری پێشکەوتن و زانیاریی و دوا ڕۆژی چاکترن، لەگەڵ هێزی تاریکی کە خۆشکەرانی ئاگری شەڕی ئەتۆمی و هیدرۆجینین، دەست پێوە گری وەستان و مانەوەی دیلیەتین.

کەریم شارەزا خۆی و شیعرەکانی وەکو من بیان ناسم کە لەم نامیلکەیەدا بەناوی (ئازادی و ژیان)ەوە پێشکەشی خوێندەوارانی ئەکەم، یەکێکە بە دڵ و بە گیان و کردەوەی دەس و پێنووس و تەباشیری، بە بەری بیرو لێکدانەوەی، یەکێکە لە سەربازانی (ڕووناکی) وتێ ئەکۆشێ کە ئەگەر هەر دەرفەتی چەنگ کەوت گۆرانی بڵێ بۆ: ڕووناکی و بەرەی چاکەو پێشکەوتن و ئازادی... لەگەڵ پێگەیاندنی نەوەکانمان لە قوتابخانەدا، وتەی چاکیش بهۆنیتەوە بە شیعر.

ئیتر شیعرەکانی هەموویان لە سەرچاوەی بایەخدان بە ئادەمیزاد و چاکە کاریی یەوە سەر هەڵئەدەن و هەموویان نیشانەی بەرچاو ڕوونی (تفاؤل) و جوانی خوازیی لێوە دیارە، گەلێکیان ئەگەر چی بە دەربڕینێکی سادەو وشەی ئاسایی و وەزنی مەثنەوەی یا دەستکارەوە ڕێکخراون، بەڵام هەموویان لە ڕێگای کۆششی دا ئەڕواننە پێشکەوتن و تەکان دان!

ڕێگە گرتنی شاعیر لە شیعردا، ئەگەر لەساڵی ١٩٥٥ بەو لاوە سەیر بکەین دەبینین جموجۆڵێکی بەگیان کەوتووەو پێشخستنی شیعرەکانی و تازە کردنەوەی و دەس بەردان لە شێوەیکۆن، هەوڵی داوە ماناو دەربڕینی تازە بخاتە ناو تان و پۆی جوانی و سروشتەوە لە هۆنراوەکانیا وەکو هۆنراوەی (شەو ١٩٥٥) و(جوانی)و (بەهار) و (ڕۆژ هەڵاتن) و ...تاد، ئەوەی لەم هۆنراوانەدا بەدی ئەکرێ بۆتە سروشتی تایبەتی شاعیر.. وێنەی ساکار و خنجیلانەی بێ گەورە کردن و زۆر وتن و رەنگ تیا هەڵسوونە، وەکو لەم وێنە جوانەدا دەر ئەکەوێ:

**تیپی حاجیلە و (گوڵووکی) ڕەنگین،**
**بوویتە نیگاری (قاڵی) ڕووی زەمین!**

کە لای من قاڵیچەیەکی دەستکردی کوردەواریی جوانکیلە بێت و بە گوڵی حاجیلە و گوڵی کێویلکە نەخشاندراو بێت، نەك مافوورێکی کاشانی ڕەنگاو رەنگ، بەهەموو جۆرە گوڵی کە هەر ناویشمان نەبیستووە و نەمان دیوە.

هەروەها لەم دیمەنەی خوارەوەدا لە وەسفی کاتی ڕۆژهەڵاتن ئەکا، دیسان لە سروشتی خۆی، ڕەنگ و بۆیەی لەوحە ڕەسمەکەی بە هێمنی و ساکارییەوە تێکەڵ کردووە:

لێـواری زەریـای ئاسـمانـی زیـوین،
ماچ ئەکا کوڵمی ئاسۆگەی خوێنین
ســــەر پۆشــــی کێـــوان
بــــە پرشــــنگی جـــوان
پەمـــــەیی تــــــەرزە،
لــــەم جێگـــــە بــــەرزە!

ئەم ڕێگەیە دیسان لە هۆنراوەی کۆرپەی فرێدراودا هەستی پێ ئەکرێ کە لەگەڵ هەستێکی مرۆڤایەتی پڕ لە بەزەیی یەوە بە تەعبیرێکی بێ گرێ و قۆرت و ڕوونەوە کارەساتی منالێکی بێ دایك و باوکی فڕیدراومان بۆ ئەگێڕێتەوە.

پاش ئەم ماوەیە لە ساڵی ١٩٥٨ بەولاوە کە دێتە سەر هۆنینەوەی بابەتە سیاسییەکان، هەر چەندە هەوڵ ئەدا هەر لەسەر هەمان ڕێگەی شیعر هۆنیینەوە بمێنێتەوە، بەڵام بەلای منەوە ئەم ئامانجەی نەهاتۆتەدی، هەر چەندە ڕەنگە ویستبێتی شیعرەکانی ئەوەندە سووك و ئاسان بکات کە کرێکار و جووتیارێکیش تێی بگا، بەڵام من بۆ ئەم مەبەستە پاکەش بێت لە نزمی ڕادەی هونەرمەندیی شیعر چاو ناپۆشم.

ئینجا بۆ ئەوەی خوێندەواری بەڕێز بە پشوویەکی هێمنەوە شیعرەکانی (ئازادی و ژیان) بخوێنێتەوە و سەرنجی خۆی نیشان بدات و ڕێ لە ڕەخنەگران نەگرم کە ئەوانیش بەناو خەرمانی (کەم و بە پیتی) هۆنراوەکانی شاعیرا بکەون و ڕای خۆیان دیار بخەن، من بێ دەنگ دەبم لە چەند وشەو دەربڕینێك، ئەگەر ڕاست بن، ڕەنگ بێ بەلای منەوە لە جێی خۆیان نەبن.

**عبدالرزاق محمد (بیمار)**

بەغدا، زانستگای وێژە

١٩٦٠/١١/٧.

# شـــــەو[1]

کۆیە: ١٩٥٥/١٢/١٤

پرشــــنگی ڕۆژی بــــە شــــەوقی زێــــڕین
نــــەما لــــە کێــــو و بــــەرزایی زەمــــین
گونــــــد و شــــــارەکان
بــــــاخ و گوڵســــــتان
گشــــتیان بــــە جــــارێ وا ڕەش داگــــەران!

**

تــــاریکی داهــــات بەســــەر دەشــــت و شــــار
مەترســــی و ئــــازار لــــە هــــەر چــــوار کنــــار
دەخشــــن وەکــــو مــــار
دەدەن پــــــــەلامار
هــــەر وەك دڕنــــدەی خــــوێنڕێژی زۆردار

**

پــــووش و دڕك و داڵ لەگــــەڵ گــــوڵی ســــوور
هــــەر وەکــــو یــــەکن لــــە شــــەوی دەیجــــوور!

---

(١) کاتێ کە شارەزای باوك هەڵسا بە دووبارە داڕشتنەوەی هۆنراوەکانی هەردوو کۆمەڵـ شیعری (ئازادی و ژیان) و (ڕێگەی دوور) شوێنی شیعرەکانی بەپێی بەروار داڕشتنیانی گۆڕی، هەروەها دەسکاری هەندێ ڕستەو دەستەواژەکانی کردووە. (ك. ك. شارەزا).

جـــــــوانی نـــــــــامێنێ

لـــه هـــیچ جـــێ و شـــوێنـێ

ســــەختی بـــه جـــارێ پـــەره دەســـتێنێ!

**

پـــــەردەی تــــاریکی هـــــەرگیز نــــاتوانێ

بپۆشــــــێ بــــۆنی گــــــوڵ و ڕەیحـــــانێ

بـــــــاخ و گـــــــــوڵزاران

کــــــــاتی بــــــــەهاران

پێـــت نـــاکرێ مـــەنعی هـــاژەی ڕووبـــاران!

**

مـــانگی پڕشـــنگدار بـــه بـــێ چەنـــد و چـــوون

لـەگـــەڵ ئەســـتێرەی بەشـــەوقی گـــەردوون

شــــەو ئــــەدەن ئینــــزار

بــــۆ وەســـــتانی کــــار

ســـەر نـــاگرێ تاســـەر تـــاریکی خـــەمبار!

**

شـــەو چەنـــد درێـــژ بـــێ ڕۆژ هـــەر دێتـــەوه

ڕوونـــــــاکی دنیـــــا دا دەگرێتـــــــەوه!!

کـــــــــاتی کەســـــــــــادی

دەبێتـــــــــــە شـــــــــادی

دەڕوا نـــــــــامێنێ دەوری بـــــــــێ دادی!

**

یـــەقین بـــە هەڵـــدێ ڕۆژی سەربەســـتی

ڕا دەدا تـــــەمی تــــاری ژێـــــر دەســـتی

گـــــــــەلانی جیهـــــــــان

ڕووخـــــــۆش و خـەنـــــــدان

دەژیـــــن ئـــــازاد و شــــاد و کامـــــەران

## جـــوانی

کۆیە: ١٩٥٦/١/٣

جـــــوانی! ئـــــەی گــــــۆرانی ژیـــــان
جـــــوانی! ئـــــەی بـــــەهاری گیـــــان
گـــــــولْ و لالـــــــــەی گولْســــــــتان
چیمــــــــەنی عـــــــەتر و ڕەیحـــــــان
نـــــــاز و لەنجــــــــەی عاشـــــــقان
وەی شـــــــۆخی ئـــــــەرز و ئاســــــمان

جـــــوانی ! ئـــــەی مایــــــە خۆشــــــی
تـــــــۆ بزوێنــــــــــــەری هۆشـــــــــی

**

ئـــــەی نەشـــــئەی بـــــاخ و گـــــولْزار
ئـــــەی پڕشـــــــنگی نیگـــــای یـــــار
ڕاکێشــــــــــــی بیـــــــــــری دڵـــــــــدار
بـــــۆ یـــــادی شـــــۆخی نـــــازدار!
بـــــۆ تـــــۆ پەروانــــــەی هــــــەژار
خـــــۆی بــــۆت ئـــــەکا فیـــــداکار!

جـــــوانی! ئـــــەی هـــــەوێنی ژیـــــن
تـــــــاجی دڵـــــــــداری زێـــــــــڕین!

**

تۆ شوعلەی کائیناتی
تۆ ڕەونەقی حەیاتی
بۆ لاوچاکان خەڵاتی
بۆ دوڵبەران ئاواتی
شیرینتر لە نەباتی
نرخداری گشت کاتی

تۆ ڕەمزی شادمانی
سەرچاوەی کامەرانی

**

تۆ ئیلهامی هونەروەر
بۆ فەن و زانین جەوسەر
بەهادارتر لە گەوهەر!
عاتیفە و عەقڵی بەشەر
دێنیە جووڵەو جۆش و گەڕ

تۆ نیشانەی دڵشادی
تۆ دروشمی ئازادی

**

جـــــوانی ڕەنـــــگ و جـــــوانی خـــــوو
جـــــــوانی بیـــــــری پێشـــــــکەوتوو
جـــــــوانی چــــــاو و کـــــــوڵم و ڕوو
جـــــــوانی کـــــــرداری بـــــــازوو،
جـــــــوانی نـــــــامووس و ئـــــــابڕوو،
بـــــە نـــــرخن تێکـــــڕا هـــــەموو!!

جـــــوانی ئـــــەی مـــــاکی بـــــەرزی
تـــــــــــــۆ ڕەوا دار و تـــــــــــــەرزی

## ڕۆژهەڵاتن

چنارۆك: ئابی ١٩٥٦

لێــــواری زەریــــای ئاســــمانی زێــــوین
مــــاچ ئــــەکا کــــوڵمی ئاســــۆگەی خــــوێنین
سەرپۆشــــــی کێــــــوان
بــــە پڕشــــنگی جــــوان
چەشــــــنی ئەرخــــــەوان
پەمــــــەیی تــــــەرزە، جــــوان و دڵگیــــرە
لــــەم جێگــــە بــــەرزە، ڕاکێشــــی بیــــرە!

**

وردە شــــــەپۆلی گــــــوڵاو و ڕووبــــــار
ئەدرەوشــــێنەوە بەرامبــــــەر گــــــوڵزار
لــــە گــــەرووی مــــەلان
لــــە شمشــــاڵی شــــوان
ئــــاوازی جــــوان جــــوان
بــــەرز ئەبێتــــەوە بەســــەر گــــردو پــــاڵ
ئەلەرێتــــەوە بــــە شــــنەی شــــەماڵ!

**

ســــوپای شکســــتەو و پەڕاگەنــــدەی شــــەو
ڕائــــەکا لــــە پــــێش تشــــوونی پــــڕ تــــەو

گوڵوکی ئاودار
گەڵاو پۆپی دار
لە باخ و گوڵزار
بە نەسیمی پاك ئەکەن شایی ژین
بۆ ڕۆژی ڕووناك دێنە پێکەنین

**

شکوفەی ناسك بەشەونم مەستە
بولبولی شەیدا شاد و سەرمەستە
سەراپا زەمین
نەخشاوە چین چین
بە گوڵی ڕەنگین
بۆ بووکی ئاسمان، بۆ ڕۆژی زێڕین
کە هەڵدێ بۆمان لە لووتکەی بەفرین

## کۆرپەی فڕێدراو

کۆیە: ئابی ١٩٥٦

فرشتەی پیرۆزی پاکە
یاخود ئەستێرەی ڕووناکە

پەروانەی لالەی ژیانە
یا پەپوولەی بێ تاوانە؟

لەمانە زۆر بەرز ترە!!
هێژا تر و تەرز ترە!

ڕۆڵەی باوکێکی فەوتاوە،
جەرگی دایکێکی بێ ناوە!

دایکی کڵۆڵی بێ کەسی
کەسێ نەبووە فریاد ڕەسی

لە سامناکی و برسیەتی جەنگ
دنیای لێ بوو بە شەوە زەنگ

لە ژێر تەمی خەمی ژیان
لێی ون بوو عاتیفە و ویژدان

بە دەستی زەردی بێ تینی
فڕێیدا کۆپەی شیرینی

تا مرۆڤێکی بیر ڕووناك
خاوەن هەستێکی بەرزی پاك

خزمەتی کرد بە ماڵ و سەر
هەر وەك ڕۆڵەی خۆی بێ و جگەر

شیری پڕ شادی پێ نۆش کرد
ڕێی سەختی ژینی بۆ خۆش کرد

تا بووە منداڵێکی چالاك
تەندروست و ئازا و دڵپاك

ئـــــــەمڕۆ نـــــــەمامی وەتـەنـــــــە
هیـــــــــوای دوا ڕۆژی ڕەوشـــــــــەنە

بـــــــۆ بەرزیـــــــەتی گـــــــەل و هــــــۆزی
بـــــــۆ نیشـــــــــتمانی پیـــــــــرۆزی

ئـــــــەمڕۆ، بچووکـــــــە بـــــێ توانـــــــا
ســـــــبەی دەبتـــــــە گـــــــەورەی دانـــــــا

یـــــا دەبێتـــــــە زانـــــــاو بـــــــوێژ
یـــــا ســـــــەرۆکی خـــــاوەن ڕاوێـــــژ

یـــــا پیتـــــۆڵێکی بـــــێ هاوتـــــا
یـــــا پســـــپۆڕێکی شـــــارەزا !!!

کـــــێ بـــــن بـــــزانن پێـــــی بڵـــــێن
دایـــک و بـــاوکی لـــە کـــوێن و کـــێن؟

مـــــــردوون، فـــــــەوتاون، مــــــاون؟
دنیـــــا چـــــی بەســـــەر هێنـــــاون؟

گوناهبـــــــار دایکـــــــی خـــــــەمبارە
یـــــــا ڕۆژگـــــــار تاوانبـــــــارە؟

لـــــــە دنیـــــــادا هـــــــەرچی زاوە،
بـــــۆ تـــــاڵی و ترشـــــی خوڵقـــــاوە؟

یـــــا بـــــۆ شـــــۆخی و لار و لەنجـــــە
یـــــا بـــــۆ ئـــــازار و ئەشـــــکەنجە؟

یـــــا بـــــۆ شـــــادی و کامـــــەرانی؟
یـــــا بـــــۆ یارمـــــەتی ئینســـــانی؟

**گـۆرانی نـەورۆز و بـەهـار**

کۆیە: نەورۆزی ١٩٥٧

بژی کژی خۆشی بەهار
جەژنی دڵدار
کاتی بووژانەوەی گوڵزار
گوڕەی گوشادی من و یار!!
**

وەرە ئەی یار
یاری شۆخ و شەنگ و نازدار
مژدەبێ نەورۆزەو بەهار
با ڕووبکەینە باخ و نزار
با ڕاکەین لەگەڵ جۆیە بار
بچریکێنین لەگەڵ هوزار
لەگەڵ قومری
لەگەڵ کەوی بەلەنجەو لار
لەگەڵ خوڕە و هاژەی ڕووبار
تێکڕا بڵێین: بژی نەورۆز
بژی کژی خۆشی بەهار
جەژنی دڵدار
کاتی بووژانەوەی گوڵزار
گوڕەی گوشادی من و یار
**

لەگەڵ لەرەی پرشنگی جوان
لەگەڵ سروەی پاکی بەیان
لەگەڵ بزەی غونچەی گوڵان
لەگەڵ بۆنی خۆشی کنێر
لەگەڵ شلێر
لەگەڵ ورشەی گیای میرغوزار
لەگەڵ لالە لەلالە زار
بە چیە بێ یا بە هاوار
تێکڕا بڵێین:
بژی نەورۆز
بژی کژی خۆشی بەهار
جەژنی دڵدار
کاتی بووژانەوەی گوڵزار،
گوڕەی گوشادی من و یار!!

## سروودی لەخەو ڕاپەڕە

کۆیە: ١٩٥٦/٨/٥

لە خەو ڕاپەڕە، هەستە بەیانە.
کاتی هوشیاریی و هەوڵی ژیانە!!

**

خۆر شەبەقی دا بە ڕەنگی پاکی
تاریکی بەزاند بەهۆی ڕووناکی
بە تۆپی شادی ڕما خەمناکی
تەمبەڵی و سستی کەوتنە هیلاکی

لەخەو ڕاپەڕە هەستە بەیانە
کاتی هوشیاریی و هەوڵی ژیانە

**

تەیری بەندکراو بە تاریکی شەو
ڕزگارن لە چنگ کۆتی سەختی خەو
پەرتی ئاسمان و زەمینن بەرەو
بۆ ئەوەی بژین ژیانێکی نەو

لە خەو ڕاپەڕە، هەستە بەیانە
کاتی هوشیاریی و هەوڵی ژیانە!

**

هاتـــــەوە ڕۆژی ڕوونـــــی هۆشـــــیاریی
ڕەتانـــــدنی شـــــەوی تـــــاری زۆرداری
دەوری شـــادی هـــات نـــەما خـــەمباری
پـــەرتو بـــڵاو بـــوو ســـوپای بـــەدکاریی

لەخـــەو ڕاپـــەڕە هەســـتە بەیانـــە،
کـــاتی هوشـــیاریی و هـــەوڵی ژیانـــە!
**

هەســـــتە وا ڕۆژی ڕزگـــــاریی داهـــــات
ڕۆشـــن بـــوو ڕێگـــەی تـــاریکی حـــەیات
قـــەفی زنجیـــری کووکـــەو کارەســـات
بشـــکێنە خێـــرا بـــە بـــازووی خـــەبات

لـــە خـــەو ڕاپـــەڕە هەســـتە بەیانـــە
کـــاتی هوشـــیاریی و هـــەوڵی ژیانـــە!!
**

ڕاپەڕە واهات کاتی ڕاپەڕین
بڕۆ بە ڕێگەی بەرزی تێکۆشین
بە هەنگاوی زڵ، بە بیری پڕ تین
بۆ بنیاتنانی کامەرانیی ژین

لە خەو ڕاپەڕە هەستە بەیانە
کاتی هوشیاریی و هەوڵی ژیانە!

## ئەی شیعر(*)

کۆیە: ١٩٥٧

ئەی شیعر تۆ هاواری
گیانی پەست و بێزاری
دەنگدانەوەی ئازاری
دڵی زاری دڵداری

**

تۆ چۆراوەی خوێناوی
زامی دنیای دێرینی
فرمێسکی قەتیساوی
ناو پێڵووی چاوی ژینی

**

پوختەی واتەی فرشتەی
هەناسەو ئاهی غونچەی
گرینەری زەمانەی
ئاوازی خەمبەخشی نەی

**

(*) پارچە شیعرێکی (ئەبولقاسم ئەلشابی)یە بە ناوی (یاشعر) بە دەسکارییەوە کردوومەتە کوردی...شارەزا.

نەغمەی شەپۆڵی جوانی
ئەفسوونی بەحری قووڵی
شادمانی دڵانی
خۆشیی پەست و مەلوولی

**

ورشەی ئەگریجەی خاوی
یاری خەندە بە لێوی
تاسەو شعووری لاوی
جووڵەی ساوای بزێوی

**

گۆرانی خۆشی گوڵی
چریکەی بولبولانی،
سرووشی مێشک و دڵی
ڕابەری عاشقانی!!

**

جوانیی پڕشنگی سووری
ساتی ڕۆژ ئاوابوونی،
لەرەی پڕشنگی نووری،
کاتی تاریك و ڕوونی!!

**

بلوێری خەونی یاری
دەنگی کەمانی گیانی
زمانی ڕۆژگاری،
بزەی لێوی ژیانی!!

# شیرین

کۆیە: ١٩٥٧/١١/٢٩

شیرین گیانی شیرینم
شکۆفەی شادیی ژینم

گوڵی گەشی دڵداریم
هەوێنی بەختیاریم!

ڕووناکی ڕێی حەیاتم
هیوای بەرز و ئاواتم!

فرشتەی عەشق و جوانیم
ماك و هۆی کامەرانیم

دولبەری پەری ڕەنگم،
نازداری شۆخ و شەنگم!

تووبی ئەگریجەی خاوت
پڕشنگی سیحری چاوت

تـــــــووبی مۆســــــــیقای لەنجـــــــــەت
ناســــــــکی دەســــــــت و پەنجـــــــــەت

تـــــــوو مــــــــەمکی ســـــــێوی کاڵـــــــــت
گوڵاڵـــــــــــەی کـــــــــوڵمی ئاڵـــــــــت!!

بـــــــا بــــــــەس بــــــێ چـــــــاوەڕوانی
ڤینۆســـــــــــی خـــــــــوای جـــــــــوانی

بـــــــــەس ڕۆژی ڕوونـــــــــم ڕەش کـــــــــە
ژیـــــــنم پـــــڕ ئـــــێش و خـــــەش کـــــە

وەرە بـــــــــا پێکـــــــــی شـــــــــادی
پێکـــــــــی عەشـــــــق و ئـــــــازادی

هـــــــەردوو پێکـــــــەوە خـــــۆش کـــــــەین
خامۆشـــــــــی فـــــــەرامۆش کـــــــەین!!

# ئــەی دڵــەی زامــدار

کۆیە: ١٩٥٧

ئـــەی دڵـــەی زامـــدار، ئـــەی دڵـــەی زامـــدار
ئارامـــت ببـــێ، بـــەس بـــێ گریـــەو زار!

بـــــەس هەڵبکێشـــــە ئـــــاهی ئـــــاگرین
بـــــەس هـــــەڵبڕێژە فرمێســـــکی خـــــوێنین

چونکـــــە بـــــێ ســـــوودە نـــــاڵین و هـــــاوار
بەرامبـــــەر یاســـــا و هێـــــزی کردگـــــار

بـــــە ئـــــاخ و ئـــــۆف و حـــــاڵ پەرێشـــــانی
نادۆزیتـــــــــەوە ڕێـــــــــی کامـــــــــەرانی

تـــــاهێزت نـــــەبێ قـــــەت نـــــابێ ڕزگـــــار
لـــــە جـــــەورو جـــــەفای چـــــەرخی ڕۆژگـــــار

فرمێسکی خەم و پەژارە بسڕە
بەرگی ئازار و مەینەتی بدڕە

زام و برینت بە مەرهەمی ژین
تیمارکە و دەس کە بە هەوڵ و کۆشین

بە هێز و ڕەنج و تینی تێکۆشان
نامێنێ کەند و کۆسپی ڕێی ژیان

بچووك و گەورە و بێ دەس و دەسدار
ئەژین پێکەوە شاد و بەختیار

# نـــەورۆز

کۆیە: نەورۆزی ١٩٥٨

نــــەورۆزە مەســـتم بـــە نەغمـــەی بولبـــول
مەســـتم بـــە عـــەتری بنەوشـــەو ســـومبول

شـــادم بـــە هـــازەی ڕووبـــاری بـــەفرین
ســـوورم بـــە شـــڵپەی شـــەپۆڵی زیـــوین

کێـــو و گـــرد و دۆڵ، بـــاخ دەشـــت و دەر
جـــوان و خـــەملیون تێکـــڕا سەرانســـەر!

گـــوڵی گـــوڵزار و درەختـــی دەم پـــاڵ
هەڵپەڕکێیانـــە بـــە شـــنەی شـــەماڵ

تیپـــی حاجیلـــەو گولـــووکی ڕەنگـــین
بووینـــە نیگـــاری قـــاڵیی ڕووی زەمـــین

خـــۆری پرشـــنگدار لـــە ئاســـمانی شـــین
پـــێ دەکـــەنێ بـــۆ چیمـــەن و نەســـرین

پۆلی پەپوولەی نەخشینی جوان
هاتو چۆیانە بەسەر ڕووی گوڵان

ئاوازی هەنگی زێڕینی سەر گوڵ
سرووشی خۆشی ئەخاتە ناو دڵ!

شمشاڵی شوان و بارەی کارژۆڵان
جریوە و جوکەی بە سۆزی مەلان

بەرەو گوێچکەی دڵ دێن لە دۆڵ و دەشت
خۆش وەك ئاوازی مۆسیقای بە هەشت

لە هەر لا ئەمڕۆ مەستە بە شادی
مەستە بە خۆشیی ڕۆژی ئازادی

ڕۆژی پچڕانی زنجیری ژیان،
جەژنی نەورۆزی کورد و کوردستان!!

# هێزی گەل

کۆیە: ١٩٥٨/٧/١٨

هێزی گەل، هێزی خەبات و ڕاپەڕین
هەر وەکو بورکانی گەرمی ئاگرین

کەوتە کڵپە داری ژینی دوژمنی
کرد بە زوخاڵ هەر لە پۆپەی تابنی

کەوتە گڕ سووتاندنی گیانی خوێنمژی
بۆ ئەوەی میللەت بەسەربەستی بژی

مەشخەڵی ئازادی هەڵکرد بۆ جیهان
بۆ گەلان ڕۆشن بێ تاکو ڕێی ژیان

قەفقەفی کۆت و کەلەپچەی ڕۆڵەکەی
تێکشکاند، بۆی سەند لە زۆردار تۆڵەکەی

عەرشی دامەزراوی سەر لاشەی بەشەر
هەڵتەکێنرا، زوو کرا ژێرەو زەبەر!

ڕەو ڕەوەی مێژوو بەرەو پێش بێ گومان
هەر ئەسووڕی، هەر ئەسووڕێ بێ وچان

## ئەی داگیرکەر

کۆیە: ١٩٥٨/٧/٢٥

ئەی داگیر کەر، ئەی داگیر کەر
ئیمپریالیزمی جانەوەر!

تا دوێنێ ژێر دەستی تۆ بووم
بە کردارت ڕەنجەڕۆ بووم

بە غەدر و زۆرداریت دیل بووم
وەك بەندکراوی باستیل بووم

بەڵام ئەمڕۆ من سەربەستم
بە مەی ڕزگاری سەرمەستم!

کە تۆم دەرکرد لە ئەم خاکە
دەژیم چۆن بزانم چاکە

چی تر پێم نالێی تۆ بەدی،
ئامانجی پیس دەهێنیە دی

کۆمۆنیستی، ڕووخێنەری
گێرەشێوێنی تێکدەری

تاوانم هەق پەرستی بوو
داوای نان و سەربەستی بوو

پاداشتم بەندیی و زنجیر بوو
ئازار دانی جەستەو بیر بوو

هەڵخستنی سێدارە بوو
بۆردومانی تەیارە بوو

وەك ئازاد خواهانی ماوماو
جەزایری زۆر لێ کراو

وەك قولەکانی ئەمریکا
پێشمەرگەکانی ئەیۆکا!

ئەی داگیر کەر، ئەی داگیر کەر
ئیمپریالیزمی جانەوەر!

گوڵی ئامانجی من گەشە
دادی تۆ نادا هەڕەشە

بە کەشتی گەل، بۆمبای ئەتۆم
هەڵناکەنرێم لە جێگەی خۆم

وەك هەورامان، کێوی کاروخ
دەوەستم بەرامبەر ساروخ

چونکە بەهێزە باوەڕم
بەرامبەرت شێری نەڕم

کوردستان وڵاتی منە،
نەك جێی پیلانی دوژمنە

منی ڕۆڵەی دڵسۆزی کورد
ڕۆڵەی نەتەوەی کاوەی گورد

سەردا نانوێنم بۆ زۆر دار
بۆ نۆکەرانی ئیستیعمار!!

جانەوەرنیم ئادەمزادم،
خاوەن بیرێکی ئازادم،

دەتکوژم پێش وەی بمکوژی
نایەڵم لە خاکما بژی

دەستی خیانەتمان بڕی
ئازادیمان بە خوین کڕی

ئامانجمان ڕێکی و ڕاستییە
ئاواتمان شادی و ئاشتییە

ئـــــــازاديخواى گـــــــەل پەرســـــــــتين
ســــــەربازى ڕێگــــــــەى سەربەســــــتين

لات ڕوونـــــاك بـــێ، ئــــەى داگيـــر كــــەر
ئـــــــەى زەرووى خــــــوێنمژى بەشـــــــەر

ســــــەركەوتن بــــــۆ هــــــەق پەرســــــتە
مــــــــردن بـــــــۆ ئيمپرياليســــــــــتە!!

# یەکێتی خەبات

کۆیە: ١٩٥٩/٢/٢٨

ســــــڵاوی گـــــــەرمی گـــــــەلی کـــــــورد
بـــــــۆ میللـــــــــەتی عـــــــارەبی گـــــــورد

ســــــــــــــڵاوێکی برایـــــــــــــــەتی
ســــــــــــــڵاوی دڵســـــــــــــــۆزایەتی

ســــــــــڵاوی یـــــــــەکێتی خـــــــــەبات
بـــــــــۆ ئـــــــــازادی گـــــــــەل و وڵات

هـــــــەر لـــــــە خـــــــاکی بارزانـــــــەوە
تـــــــا بەســـــــرە بـــــــێ بڕانـــــــەوە،

کـــــــاروانی گـــــــەل لـــــــە ڕێگایـــــــە
لەگـــــــەڵ دوژمـــــــن لـــــــە جەنگایـــــــە

بـــــــۆ دەستخســـــــــتنی سەربەســـــــتی
بـــــــۆ ڕزگـــــــاری لـــــــە ژێـــــــر دەســـــــتی

لەسەر ڕێ و پەیڕەوی شۆڕش
بە بێ وچان دەکەن کۆشش

لاوانی هەردوو میللەتان
عارەب و کوردی قارەمان

بە باوەڕێکی ئاسنین،
بە هیمەتێکی پڕ لە تین!

کۆماری گەل دەچەسپێنین
ڕیشەی ئیستیعمار دەردێنین!

نیشتمانێکی سەرفیراز،
جەماوەرێکی ئاشتیخواز،

ژیانێکی پڕ ئازادی
پڕ بەختیاری و دڵشادی

بـــــۆ هـــــەردوو گـــــەل دەهێننـــــەدی
نـــــــاهێڵن نـــــــاکۆکی و بـــــــەدی

ئەوســـــا میللـــــەتی کـــــورد زمـــــان
لـــــەناو چـــــوار چێـــــوەی کوردســـــتان

لـــــــــە دەوڵـــــــــەتێکی هاوبەشـــــــــی
بەســـــــەر بـــــــەخۆیی و ڕووگەشـــــــی

دەژی وەك گـــــــــەلانی ئـــــــــازاد
ســـــەر بـــــەرز و کامـــــەران و شـــــاد

# دروشمی سوپاس

بەغدا: ١٩٥٩/٣/١

لە گوڵزاری پاکی دڵان
دەبەستین چەپکێکی جوان

لە گولغونچەی خۆشەویستی
پاراوی خوێنی سەربەستی

ئاودار و ناسک و عەترین
گەش و گوڵ بە شەونمی ژین

بۆ پیشەوای تاقانەمان
عەبدولکەریمی قارەمان

هەڵکەری مەشخەڵی خەبات
فریاد ڕەسی گەل و وڵات

ڕووخێنی ئیمپریالیزم
قڕکەری هێزی فاشیزم

تێکدەری عەرەشی بەندەگی
لەناو بەری دەرەبەگی

دروشمی سوپاسی گەل بێ
ڕەمزی پاداشتی کۆمەڵ بێ

بۆ پاڵەوانی شۆڕشمان
بۆ پەیامبەری کۆششمان

کۆششمان لە ڕێی ژیانا
لە پێناوی نیشتمانا،

بۆ دیموکراسی و سەربەستی
بۆ کامەرانی و بۆ ئاشتی!

## یــادی شــۆڕشی تــەمووز

کۆیە: تەمووزی ١٩٥٩

زەنگــــی کـــاروانی ڕێــــی ژیـــان
بڵێســـــــەی گـــــڕی تێکۆشــــــان

بەرژەوەنـــــــدی بـــــــەرزی وڵات
خـــــەبات لــــە پێنــــاوی ئـــــاوات

دەهێننــــە جــۆش هــۆش و هەســـتم
هـــان دەدەن خامــــەی سەربەســـتم

بــــۆ دانـــــانی شـــــیعری تــــازە
خۆشــــتر لــــە دەنگــــی ئـــــاوازە

ناســــکتر لــــە خونچـــەی بـــــەهار
جــــوانتر لــــە نەشـــئەی لالـــــەزار

لــــــە یـــادی ڕۆژێکــــــی پیـــــرۆز
جاویـــــدان وەك جــــەژنی نــــــەورۆز

جەژنی تەمووزی ئازادی
ڕۆژی نەمانی بێ دادی

ئەو ڕۆژەی کە سوپای دلێر
ڕاپەڕی چەشنی بەچکەشێر

لە ناو چەرگەی بەغدای شیرین
چاوگەی خەبات و ڕاپەڕین

زنجیری دیلییەتی پساند
کۆشکی پاشایەتی ڕماند

بە پشتگیری میللەتی مەرد
دلێرانی ڕۆژی نەبەرد

بە سەرکردەی عەبدولکەریم
بنیاتنەری جوانترین ڕژیم

ڕژێمی بەرزی کۆماری
دیموکراسی و بەختیاری

لەو ڕۆژە لاشەی خائینان
وك لاشەی سەگ ڕاکێشران

ئەوەی دوژمنی میللەت بوو
هەر بە دەستی ئەو لەت لەت بوو

ئیستیعمار و کۆنە پەرست
دەستەی زۆردارانی فاشست

کۆستیان کەوت، پشتیان شکا
بە شۆڕشی گەل و سوپا

تاجی شایەتی نا ڕەوا
تەخت و بەختی عەبدولئیلا

حـــوكمی نـــووری ســـەعیدی پـــیس
لـەگـــــەڵ ئیســـــتیعماری نگـــــریس

تێهەڵـــــــــــدران و تیـــــــــك دران
هـــــەتا هـەتایـــــە گـــــۆڕ کـــــران!!

# تــۆ[1]

کۆیه: ١٩٦٠/٦/١٤

ئــــای لــــه شــۆخی ئـــەم بـــەژن و ئـــەم باڵایـــه!
وای لـــــه ســــیحری ئـــەم چـــاو و ئـــەم نیگایـــه!
هـــەی هـــەی لـــه ســووری ئـــەم لێــو و گۆنایـــه
لـــــه بـــێ گـــــەردیی ئـــــەم گەردنـــــه مینایـــه!!!

**

چەنــد نــازداری؟ چــەن شــیرینی؟ چەنــدجوانی؟
وەکـــــو پـــــەری شـــۆخ و شـــــەنگی ئاســـــمانی!

خۆشـــــــــی وەکــــــــو گـــــــۆرانی وەك ئـــــــاوازه،
وەك شـــــــەوانی پـــــڕ خــــــەوبینینی تـــــــازه!

شــــــــیرینی وەك گـــــــۆرانی و خۆشەویســـــــتی
وەك ئــــــازادی و ئاســــــایش و سەربەســــــتی!!

**

(١) هەڵبەستەکەی (صلوات في هيكل الحب)ی ابو القاسم الشابي بووه بەسەرچاوەی ئیلهامی ئەم هەڵبەسته.

بــۆ پــێم نــاڵێی تــۆ تــۆچی؟ تــۆ ئینســانی؟
یــــا فریشـــــتەی بەهەشــــتی جاویــــدانی؟

یــــا پەیکــــەری ڤینۆســــی خــــوای جــــوانی؟
تــۆ کــام وێنــەی؟ دەســکاری کــام فــەننانی؟
یــــا کــــام نیگــــای بــــەهاداری ژیــــانی؟!

**

تــۆ تــۆ گیــانی پــڕ جۆشــی زینــدەگانی!
تــۆ تــۆ ژیــانی پــڕ خۆشــی و کامــەرانی!!

## دوو ڕوو

شەقڵاوە: ئابی ١٩٦٠

کـــــــــاکی دوو ڕوو تـــــــــازووە زوو
بالێــــــك ئاشـــــکرابین هــــــەر دوو

بەســـیە چـــی تـــر تـــەفرەم مـــەدە
بــــــەو کـــــردارە پـــــیس و بــــــەدە

بــــۆت دەرکــــەوت خــــوو ڕەوشــــتم
منـــــیش زۆر چـــــاك تێتگەیشـــــتم

ئـــــــەم لا ڕووەت لەگــــــەڵ منــــــــە
لاکــــــەی تــــــری لای دوژمنـــــــــە

هــــــەر ڕۆژە ســـــازی لــــێ ئـــــەدەی
بــــۆ مەبەســــتێك هەڵپەئەکــــــەی

ڕۆژێ بنتانەری شادی
ڕۆژێ تێکدەری ئازادی

دەمێ لایەنگیری ئاشتی،
خەباتکەری ڕێگەی ڕاستی!

ڕۆژێ جەنگاوەری شەڕی
بۆ ناحەزم هەڵدەپەڕی

ئەمڕۆکە لەگەڵ یارانی،
سبەی لای تاوانبارانی!

لەگەڵ گورگا لە سەیرانی
بۆ مەڕیش چاو بە گریانی

بەزار دوژمنی دوژمنی
بەکردار دوژمنی منی

واته و ڕاوێژ و گوفتارت
زۆر دوورن لەگەڵ کردارت

بەڵام من بڕیار و کارم
یەکن لەگەڵ قسەی زارم

ئەوەی دوو ڕووبێ ڕوو ڕەشە
لە ئینسانیەت بێ بەشە!

تا دەمهاوێنە ناو گۆڕم
یەك ڕوومە باوەڕ ناگۆڕم

سەر و گیان و ماڵ بەخت ئەکەم
بۆ نیشتمان و گەکەکەم!!

کەریم شارەزا

# ڕێگەی دوور

١٩٧١

مطبعة النعمان – النجف الاشرف

## پێشەکی

## با ئەم هەڵبەستانە بخوێنینەوە

نووسینی: عبدالرزاق بیمار بەغدا/١٩٧٠

ئەم هەڵبەستانەی کە لەم بەرگەدا کۆکراونەتەوە هەڵبەستی کەریم شارەزا نە، کە لە ساڵی ١٩٦٠ دا کۆمەڵە هەڵبەستێکی تری بە ناوی (ئازادی و ژیان)ەوە بە چاپ گەیاندووە و گەلێ هەڵبەستی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانیشدا بڵاوکردۆتەوە، شارەزا یەکێکە لەو نووسەرانەی ئەیانەوێ هەستی دەروون و ژیانی کۆمەڵایەتیمان لە چوارچێوەی هەڵبەستدا وێنە بکێشن، نەك بەناوی (پەلاماردانەوە) سارتەر گوتەنی، بەڵکو بۆ بە جێهێنانی پێویستیەکی سەر شانیان بەرامبەر ژیان و کۆمەڵ.

واتە هەڵبەست بووەتە بانگەواز و وتەی ڕاپەڕینی ڕێڕەوی کاروانی ڕەنجبەرانی گەلی کورد کە هەردەم بەرەو پێشکەوتن و ئازادی مل ئەنێ، ڕۆیشتنێك کە:

**قارەمانانە، بە تەرزێ**

**کێو لە بەرمانا بلەرزێ**

**بڕۆین بەرەو ئامانجی دوور**

**ئازا و جەسوور**

**تاکو یەك یەك ئەم کۆتانە**

**کۆتی دیلیی ئەم ژیانە**

**ئەپچڕێنین!!**

ئــەم هەڵبەســتانە كــە هەنــدێ لای شۆڕشــی كوردســتان و بەسەرهاتی میللەتیكورد و خوین و فرمێسك و هیواو ئاواتی خەڵكی كوردستان وێنە ئەكێشن، ڕەنگە بڵێن هەڵبەستی شۆڕش نین، چونكە شاعیر، لەناو ئاگری مەیدانی شۆڕشدا نەیهۆنیوەتەوە! منیش وەكو ڕەخنەگرێك كە سەیر ئەكەم، لە هەموو پشوو و هەناسەیەكی هەڵبەستەكاندا ڕاستگۆیی و دەنگی دڵێكی بە كوڵ و زەنگی بیرێكی پێشكەوتوو ئەبینم و ئەبیەم، كە ئەمانە هەمووی پیشەی مرۆڤێكی ڕاستگۆی بەهەستەو دۆست و پاڵپشتی ڕاستەقینەی شۆڕشە.. ئەگەر -گریمان- شۆڕشگێڕیش نەبێت بە تایبەتی لەو سەردەمەدا كە هەموو وڵات كراوە بە زیندانیك و تینی گەرمایی و گڕی شۆڕش گیانی سەرما بردووی هەموو دڵسۆزێكیان گەرم ئەكردەوە و لەو بڕوایەشدام ئەوەی بە چرپەیەك، بە نیشانەو هێمایەك لێرەدا جێی كراوەتەوە گەلێ بە كاكڵ و زیندووترە لە خۆ سوور كردنەوە و دانەدەم و هەڵوێستی دروست كراو، بۆیە شارەزا لەناو كرۆكی ژیانەوە، لە سەرخۆ و بە تێبنییەوە بە گوێی ڕۆڵە برسی و زراو رژاوەكەیدا ئەچرپێنێ:

**ڕۆڵەی بەرخم**
**هەرچەندە ئێستا دەروونمان**
**دۆزەخە، كوورەی ئاگرە**
**دنیامان تاریك و تەنگە**
**شەوە زەنگە**
**بەڵام سبەی**

**خەباتی خوێنینی دەستەی**

**دڵسۆزەکانی نیشتمان**

**بۆ هەموومان**

**ئەبێتە شەفەقی گەشی**

**سپێدەی سیحراویی بەیان!!**

کە لێرەدا دەستنیشانی (دەستەی دڵسۆزەکانی نیشتمان)ی کردووە، ئەوانەی (خوێنەکەیان ڕەنگی شەفەقی بەر بەیانمان بۆگەش و ڕووناك ئەکەنەوە)

زانیویەتی چی ئەڵێ و لە چ سووچێکەوە هونەری بۆ شۆڕش تەرخان ئەکا! و تا چ ڕادەیەك ڕاستیی دەربڕین دیاریی ئەکات.

بەڕاستی هەڵبەستی سیاسی وەك بابەت زۆر ناسکەو دوور نییە لە دەس زۆر کەسدا ئەگەر نەشکێش درز بهێنێ چونکە وریایی و بەهرەیەکی قاڵ و پاڵاوتەی ئەوێ و بۆ ئەوەی نەبێتە مەیدانی گێرانەوەی کارەساتی ڕووت، یا ڕووتێکردن و وتار خوێندنەوە، یا تێ ئاخنینی دروشم و ئاڵای زەق و بۆ ئەوەی ڕووناکی هەست و سۆز و خەیاڵی تیا کز نەبێت، پێویستە لە تووشهات و پەیچووڕێکی ژیان و کردەوە هەڵقوڵابێت.

ئیتر شارەزای شاعیر، لەبەر تیشکی ئەو سەرنجانەی کە هەر دیارمان خستن و لێمان نەکۆڵینەوە جۆرەها هەڵبەستی ڕەنگینی – بەهیواو بەرچاو ڕوونییەوە - لەم دیوانەدا پێشکەش کردوون.. کە بانگی هەموو خوێندەوارێك ئەکەم بۆ خوێندنەوەیان...فەرموون با بیان خوێنینەوە و سەرنجی خۆمان نیشان بدەین.

# سپێدە

کۆیە: ١٩٥٥/٧/١٤

لادرا پـــــەردەی شـــــەوی تاریـــــك و ڕەش،
دەرکـــەوت ڕوونـــاکی ئاسـۆی سـوور و گـــەش!

دەست و پەنـدەی بـای شـەماڵی سارد و تـەڕ
ســـڕیەوە پـــەلکی گـــوڵانی دەشـــت و دەر

شـــەونمی ســـاف و ســـپی چەشـــنی بلـــوور
ینشـتە سـەر بـەرگی گـوڵ و لالـە و چنـوور

شـــەو نـــەما دەردو خـــەم و زیللـــەت بـــڕا
بـــانگی ڕوونـــاکی حەقیقـــەت جـــاڕ درا!!

میللـــەتانی مەســـتی نووســـتن ڕاپـــەڕین
تا بە سەربەستی و بە سەر بەرزیی بژین!!

## خۆزگە

کۆیە: ١٩٥٦

خۆزگە بولبول هەر وکو تۆ
بەسەربەستی لە دەشت و کۆ

ئەفڕیم بە سەر پاڵ و نزار
بەناو باخ و گوڵ و گوڵزار.

بە ئاوازی نەرمی شادی
ئەم وت گۆرانی ئازادی

سرووشی خۆشی بەهارم
ئەچپاند بە گوێچکەی گوڵزارم

بە مەی پاکی دەمی غونچەم
دڵشاد و مەست ئەبووم هەردەم

دەژیام ژینی بەختیاری
ڕزگار دەبووم لە زۆر داری

بـــــێ بەنـــــدكردن و پـــــەل بەســــتن
لەســــــەر یـــــەك دوو وشـــــە وتـــــن

بـــــــەری ڕەنجـــــم ئەهاتـــــــە دەس
نـــــە ئەبوومـــــە ژێردەســــتی كــــــەس

زۆر شـــــاد ئـــــەبوو دڵـــــەی مــــاتم
ئەگەیمـــــــــە هیــــــــواو ئـــــــاواتم!!

## دڵسۆزی

کۆیە: ١٩٥٧

دڵســـــــۆزم بـــــە گیـــــان و بـــــە دڵ
وەك دڵســـــــۆزیی بولبـــــول بۆگـــــوڵ

بـــــۆ نـــــازدارە قەشـــــەنگەکەم،
بـــــۆ یـــــارە شـــــۆخ و شـــــەنگەکەم!

بـــــۆ ســـــیحری مەســـــتی چاوەکـــــەی
پێچـــــی پەرچەمـــــە خاوەکـــــە

بـــــۆ نـــــەرمیی دەســـــت و پەنجەکـــــەی
ئـــــاوازەی لار و لەنجەکـــــەی

بـــــەژن و بـــــاڵاو کراســـــەکەی
ســـــروەی عـــــەتری هەناســـــەکەی

بـــــۆ دڵـــــە پـــــڕ لـــــە جۆشـــــەکەی
بـــــۆ خۆشـــــیی نـــــاوە خۆشـــــەکەی!

# ئەی نازەنینم

کۆیە: ١٩٥٧

تۆی نازەنینم، گیانی شیرینم
ڤینۆسی گەشی ئاسمانی ژینم!
سەروەی شەماڵی چلەی هاوینم
جوانی شەفەقی ئاسۆی خوێنیم
تۆی تەنیا هەرتۆی ئەی نازەنینم

**

شەوقی ڕووناکی شەوی دەیجوورم
لە رەی پڕشنگی بڵێسەی نوورم
نزیکەرەوەی ڕێی سەختی دوورم
هۆی لێکدانەوەو هەست و شعوورم
تۆی تەنیا هەر تۆی ئەی گوڵی سوورم

**

شاگوڵی گەشی باخی بەهارم
نەشئەی شکوفەی جوانی گوڵزارم
مەرهەمی زوامی دڵەی زامدارم
شیفا و دەرمانی جەستەی بیمارم
تۆی تەنیا هەر تۆی ئەی تاقە یارم

**

مایەو قازانج و سوود و سامانم
هیواو ئامانجی ڕۆژ و شەوانم
هۆی حەسانەوەی  ڕێگەی ژیانم
تین و تەوژمی خوێن و ئێسقانم
تۆی تەنیا هەر تۆی ئەی گوڵی جوانم

**

هێزی بزوێنی تواناو تینم
مایەی خۆش بەختی دڵەی غەمگینم
فریشتەی شۆخی سەر ڕووی زەمینم!
سەرچاوەی عەشق و ئایین و دینم،
تۆی تەنیا هەر تۆی گیانی شرینیم

## دەچـــم

کۆیـە: ١٩٥٧

بچم یا نـەچم!
بۆچی من بچم؟!
بچم بۆ کۆڕێ هـەوڵ و تێکۆشان؟
بۆ ڕێگـەی سەختـی
کاروانـی ژیان؟
تا کێشـەیەکی میللـەتم مابێ
دەبێ ئـەو باره
لـە ئـەستۆمابێ!
کارم خـەتـەربێ و بار تـەلـەزگە بێ
دەرچوونم لێیان
بـەسەد خۆزگە بێ
**

بۆچی بێ بـەربم
وەك داری زڕبم
بۆ پـەرێشان و شیپرزه و شڕبم؟!
بۆ تـەنیا هـەر من
ڕۆڵـەی میللـەتم

بۆچی هەر من بۆی
مردەی مەینەتم؟!
**
بچم یا نەچم؟
بۆچی من نەچم
بۆجەرگەی خەبات
بۆ شادیی گەل و ئازادیی وڵات؟
رۆڵەی دڵسۆزی
خاك و میللەت بم
پێویستە بۆیان
جگەر لەت لەت بم!
ئەگەر من نەچم
ئەگەر تۆ نەچی
کێ لێمان لادا دژواری و کەچی؟!
بۆچی سەرسام و
بۆچی دوو دڵ بم؟
دەبێ یان دڕك

یا نەخۆ گوڵ بم
من گولێ گەشی باخی ژیانم
چرۆی درەختی هیوای دڵانم!
دەروونم پاکە
مەبەستم چاکە
لە تێکۆشانا ڕێگەم ڕووناکە
بۆچی دوو دڵ بم با یەکسەر بچم
بێتو گەر نەچم
مات و مل کەچم
وا دەچم دەچم!!

# هەڵپەرست

کۆیە ١٩٦١/٣/٧

دۆست بووی و لێم بووی بە دوژمن
ئەی هەڵپەرست
هەی درۆزن
تا دوێنی خۆشەویستت بووم
پێویستت بووم
دڵسۆزت بووم
خزمەتگوزواری هۆزت بووم
بە بەرگی خۆم
بە نانی خۆم
بە هێزی بازوو و شانی خۆم
پشتم گرتی
لە ڕۆژی ڕەش
لە تەنگانە
کاتی پیلانی بێگانە
کەچی هاویشتمتە باوەش

ناحەزانی دڵ پڕ لە غەش
بە ناچاری
جگە لە مەش
ئەمڕۆ لای تۆ بەدکردارم
تاوانبارم
یا نۆکەرم بۆ بێگانە
بۆ ئەوەی پیشەی تاوانە!!
**
ئەی هەلپەرست
هەی بۆ ڕێگەی هەق بەرهەڵست
تۆچی ئەبی فەرموو ببە
بەڵام ئەمن خاوەن هەستم
هەق پەروەرێکی سەربەستم
بێ تاوانم
هەرگیز من وەك تۆ ناتوانم
هەر ڕۆژە ڕەنگێ برێژم

جۆره گوفتارێ ببێژم
هەردەم بە کردار و هۆشم
بۆ بەرژەوەندیی میللەتم
تێدەکۆشم
تاکو مردن سەر دانا نوینم بۆ دوژمن
گەر دەرێنن هەردوو چاوم
ناگۆڕێم و نەگۆڕاوم
چی بووبم هەر ئەوە دەبم
هەتا هەبم!!

# كارگەر و جووتیار

کۆیە ١٩٦١/٣/١٤

ئەی کاکی خۆم
کاکی فەلاحی ڕەنجەڕۆم
منیش هەژاری وەکو تۆم
کارگەرێکی ڕەنج خوراوم
لە کاروانی کامەرانی
بە جێماوم
بە زنجیر و داوی ژیان
بە گۆتی سەختی گوزەران
هەردوو بەندین
هاو بیرو هاو بەرژەوەندین
**
پاکێتی چاوگەی بڕوامان
ڕووناکی ئاسۆی هیوامان
نرکەی چەوسانەوەی هەژار
زرمەی قەمچی دەستی زۆردار
لەسەر پشتی هەق خوراوان
لەگەڵ ناڵەی
لێ قەوماوان

هانمان دەدەن بۆ تێکۆشان
بۆ خۆشی و ئازادی ژیان
هاوار دەکەن: تاکەی سستی؟
تاکەی نووستن؟
لە خەوی شوومی غەفڵەتا
هەستن هەستن!
بۆ سەرکەوتن
بۆ ڕزگاریی گەل و وڵات
ڕۆژی هەوڵەو ڕۆژی خەبات!!
**
ئەی کاکی خۆم
کاکی فەلاحی ڕەنجەڕۆم
هەردەم لە ڕێگەی خەباتا
من لەگەڵ تۆم
لەم ڕێگایە
پڕ هیوایە
نابێ گوێ بدەین بە گرتن
یا گوللە باران و کوشتن
قارەمانانە بە تەرزێ

کێو لە بەرمانا بلەرزێ!
بڕۆین بەرەو ئامانجی دوور
ئازا و جەسوور
تاکو یەك یەك ئەم کۆتانە
کۆتی دیلیی ئەم ژیانە
ئەپچڕێنین
پەردەی تاریکی ئەدڕێنین
ڕۆژێکی تازە دا دێنین
لەگەڵ ژیانێکی نوێ
ژیانێکی کامەرانی
پڕ لە خۆش و شادمانی
بۆ ئەم گەلە
چاوە نوارە
بۆ ئەم میللەتە هەژارە!!

# جەژن

شەترە ١٩٦٢/٥/٢

جـــــەژن لای هـەنـــــدێ گۆشــــت و پـــــڵاوە
خـەنـــــە و خـامـــــەك و شـــــایی و شـــــەكراوە!

دوڕ و مـــــــــــــــرواری و زێـــــــــــــڕ و دراوە،
بـــــەڵام ئـەوانـــــــە خــــــەیاڵیان خـــــاوە

جــــــەژن، ئـــــــازادی بیــــــرو بـــــــاوەڕە!
جـــــەژن ئاشـــــتییە و نــــــەمانی شــــەڕە!!!

## نامەیەک لە شەترەوە

شەترە ١٩٦٢/٢/٢٥

هەر چەندە ئێرەش خاکی دۆستانە
جەرگەی خەبات و جێی سەربەستانە

بەڵام خۆم لێرەو گیانم لەلاتان
دەسووڕێتەوە وەك مەلێکی جوان

بەسەر قەندیل و هەیبەسولتانت
بە ناو دیمەنی باخ و ڕەزانت

دەمژێ پاکیەتی لا لەزارانت
بۆن دەکات بۆنی گوڵ و ڕەیحانت

تا تێر تێر دەبێ لە گوڵزارانت
لە سەروەی نەرمی ناو نیزارانت!

شاد و مەست ئەبێ بە خۆشی خاکت
بەمەی ئاونگی گولشەنی پاکت

زوو زووو بــۆی ئــەکا گەشــتێ لــە ناکــاو
خێــرا لــە مــاوەی جوولّــەی نیگــای چــاو

وەك گەشــــتەکانی یــــووری گــــەگارین
جێرمــــان تیتــــۆف و کۆلّۆنێــــل گلــــین!

# شیوەنی کەمال(*)

شەترە ١٩٦٣

مـــن ئـــەو ڕۆژە ناخۆشـــەم لـــە بیـــر نـــاچێ
مـن ئـەو غـەمـەم هـەرگیز لـە دڵ دەرنـاچێ

کـە دیـم کـەمال، هـەردوو دەستی زنجیـر بـوو
ئـــەم لاو ئـــەولای پاســـەوان و سەشـــتیر بـــوو

دەورو پشـــتی پـــڕ تـــرس و پـــڕ گومـــان بـــوو
دڵـــی میللـــەت، لـــە پەسـتی دا زینـدان بـــوو

بیـــری بـــەرزی، تێـــر و مەســـتی بـــڕوا بـــوو
دلێرێکـــــی چـــــاو نـــــەتـــــرس و پـــــۆلا بـــــوو،

چنـگ لـەسەرشـان ڕایـان کێشـا بـۆ کوشـتن
بـۆ نـاو دەریـای مـەرگ و نـەمانی بـێ بـن!

---

(*) کـەمال ڕەشید حـەوێزی دۆستی گیـانی بـە گیـانیم بـوو بـە دەستی ڕەشی خوێنڕێژانی حرس قومی لـە ١٩٦٣/٧/١٧ شەهید کرا.

هەندێ وەستان هەندێ کەوتنە چۆکدادان
میشك و جەرگی بوون بە سێرەی جەللادان

دۆستی گیانی و خۆشەویستی شارەزا
لەگەڵ تەقە گیانی لە لەش ترازا

**

خاکی سووری ناو ئۆردوگای هێزی ڕەش
لاشەی کەمال تێر تێر بگرە لە باوەش

هەر ئەمڕۆیە، هەر ئەمڕۆیە لێت میوان
سبەی دەچێ بۆ بەهەشتی شەهیدان

## لە ئەشکەوتێدا

شەترە ١٩٦٤

لە شەوێکی تاریك و تەنگی زستانا
لە ئەشکەوتێکی بێ دەنگی
کوردستانا
لە خێزانێکی هەژاری
رووت و ڕەجاڵ
هەموو عەمەلمەندە و منداڵ!!
دەهاتە گوێم
دەنگی منداڵێکی برسی
کە دەیپرسی
لە دایك و باوکی کڵۆڵی
ئێستا ئێمە بۆ بچێژین
سەرما و سۆڵی
ئەم ئەشکەوتە تەنگو تارە
نا هەموارە!
چۆن توونا کەین
برسیەتیمان
بە دەست و برد

دایکی کڵۆڵ بۆی تەواو کرد:
چۆن دەتوانین
جێ بە جێ کەین پێویستیان؟
لە بەرچی لێمان حەرامە؟
بچینەوە
شار و دێی باب و باپیرمان
بێتەوە کار
کوڵنگ و هەو جار و نییرمان؟!
**
زۆر بە نەرمی
لەسەرەخۆ
بە دڵێکی پڕ لە ندۆ[١]
باوکی وەڵامی دایەوە:
((کوڕی شیرینی بەنرخم
ڕۆڵەی بەرخم!
خۆت ڕاگرە

---

(١) ئەندۆ، ئەندۆهـ: غەم. (وشەیەکی فارسییە).

هەر چەندە ئێستا دەروونمان
دۆزەخە، کوورەی ئاگرە
دنیامان تاریك و تەنگە
شەوە زەنگە
برسینە، ڕووت و ڕەجاڵین
بێ ڕێ و جێ و ماڵ و حاڵین
بەڵام سبەی
خەباتی خوێنینی دەستەی
دڵسۆزەکانی نیشتمان
بۆ هەموومان
دەبێتە شەفەقی گەشی
سپێدەی سیحراوی بەیان!!
ڕۆژی ڕووناکی نەورۆزی
میللەتی کورد
ڕۆشن دەکاتەوە دڵی
درشت و ورد
ئەوسا هەموو دەچینەوە

شار و دێی باب و باپیرانمان
دێتەوە کار
کوڵنگ و هەوجار و نیریمان
بۆ گوزەران
دەکەینەوە
ڕووپەڕێکی تازەی ژیان
بە سەر بەستی و بە ئارەزوو
لەگەڵ هەموو
دۆست و خزمان
دەبینەوە بەیەك خێزان
دەیکەین بە ئاهەنگ و سەیران
لەبەر دەکەین پۆشاکی جوان
خۆشترین نان
دێتە دەستمان
بە ئاسانی
تێکرا دەژین
بە ئازادی و کامەرانی!!

# پەنجەی دێوی شەڕ

شەترە ١٩٦٦

ئەمجارەش پەنجەی دێوی شەڕ
لە ناوماندا
کەتەوە گەڕ
بۆ هاڕینی دەستەو سەر و
مێشك و جگەر
بۆ فەوتانی
میللەتی کوردی تێکۆشەر
ڕاناوەستێ لە تێکدانی
کێڵگەو باخ و ئاوەدانی
خوێنی هەزاران شۆخ و شەنگ
هەزاران نازداری قەشەنگ
تێکەڵ ئەکا بە خاك و خۆڵ
لە شار و دێ
لە دەشت و دۆڵ
دەیکا بە نەخش و نیگاری
تابلۆی مەرگ و وێرانکاریی
**

گریان و زیڕە و هاواری
دایکی کڵۆڵ و غەمباری
ڕۆڵەی ساوای باوك كوژراو
لەگەڵ لرفەی گڕی گەرمی
دار و پەردووی شاری سووتاو
لەگەڵ تەقەو گرمەی چەكی
پێشمەرگەکان
لە گشت لایەکی نیشتمان
تێکەڵ دەبن
لەگەڵ بانگی
یا ئازادی یا نەمردن!!
ئەم دەنگانە
لای خۆمان و لای بێگانە
بۆ میللەتمان
دەبن بە ئاوازی تاری
سیمفۆنیای فیداکاریی
گوێی ئەرز و ئاسمان پڕ دەکەن
لەکاری پیسی ئەهریمەن
تا ئاهوورە مەزدای مەزن

خوداوەندی چاکە کاریی
پشتیوانی تێکۆشانی
ئۆردووگای هێزی ڕزگاریی
لە ئەهریمەن و کرداری
نالەباری
دێتە وەڵام
دڵی بەجارێ پڕ دەکا
لە ترس و سام
تا دان بنێ بە ناچاری
بە مافی کورد
لە ژینێکی سەرفیرازی و
بەختیاری
لە کوشتار و وێرانکردن
واز بهێنێ
کۆتری سپی بۆکوردستان
ئاوازی ئاشتی بخوێنێ!!

## وەڵامی دۆستێک

١٩٦٨/١٠/٢٧ هەولێر

پــێم دەڵێــی: (( بــۆچی ناچیــەوە کۆیــە؟
خــۆ شــاری کۆیــە، هــەوار گــەی تۆیــە!

جێــی هــەزار ســاڵەی بــاب و باپیرتــە
ســەرچاوەی هــۆش و بــاوەڕ و بیرتــە

بێشــکەی منــداڵی و دنیــای شــادیتە،
جەرگــەی خــەباتی ڕێــی ئازادیتــە

بەهەشــتی ژینــی کامەرانییتــە،
ســەیرانگای تــافی نەوجەوانییتــە!

ڕووبکــە بــاواجی و هەیبــە ســولّتانت
مەســت بــە بەخۆشــی بــاخ و رەزانــت!))

**

برا کوا جوانیی هەیبە سوڵتانم؟
خۆشیی سەیرانگای ئۆمەر خووچانم؟

کوا کەندەکۆخ و باخی ئاشانم؟
شایی و هەڵپەڕکێی کانی بسکانم؟

کوا سەیر و سەفای میرگوزارنم؟
کۆڕەوی دەستەی چاو خومارانم؟

کوا کەیف و شادیی جارانم؟
بەزم و ئاهەنگی کۆڕی یارانم؟

کۆیە بە جارێ باری گۆڕاوە
کالاو بەرگێکی ڕەشی پۆشاوە!

شاری هونەر و شیعر و جوانی
کەوتۆتە گێژی پاشا گەردانی!

کێ ئاشتیخواز بوو، ئەمڕۆ شەر خوازە
بۆ برا کوشتن وا سەر فیرازە!!

هەر هێز لە کارەو هەق باسی پەشمە
خەباتی باوەڕ هەر کەشمە کەشمە

من لەم کۆڕەدا چەکم خامە بێ
بیری ڕووناکم بڕوا نامە بێ.

چۆن باوی دەبێ واتەو گوفتارم؟
جوان پەیڕەو دەکرێ کارو کردارم؟!

ڕۆژ ڕۆژی چەکەو چەکبازیی باوە،
هەر بگرە بگرەو هەر ڕاوە ڕاوە!!

لە جێی گەردانەو مەدالیای زێڕین
ڕشتەی گوللەیە و قەوارەی برین

تێکۆشەرانی نەوجەوان و پیر
بوینە خۆراکی هاوەن و شەستییر!

زۆر بەی دۆستانم لە تازەو کۆنە
نیشتە جێی گۆڕی گردی کە کۆنە(*)!!

لە جیاتی خەندە، زاری و گرینە،
لە جێگەی بەزمی شەوارە شینە!!

خەرمانی خەمی شارەکەی کۆیە
ئەمڕۆ بە جارێ لە دڵما کۆیە

چی لە ناو شار و شاخ و چەمدایە،
لە نێو خەڵتانی خوین و خەمدایە!

ئەم کارو بارو دەزگا و دیمەنە،
تا بلۆی خوێناوی دەست ئەهریمەنە!!

**

(*) کەکۆن: گۆڕستانێکی کۆن و ناودارە لەکۆیە.

بەڵام لام ڕوونە ئەم تۆف و تەمە
ئەم کارەسات و ئەم خوێن و خەمە

بەیانی بۆمان پڕشنگی نوورن
مزگێنی هێنی شەفەقی سوورن!

شەوقی ڕووناکی ڕێگەی ژیانن
ڕۆشنکەرەوەی ڕێی تێکۆشانن

خەباتی خۆم و دەستەی دۆستانم
کاتێ هاتە بەر بۆ کوردستانم!!

کۆتری ئاسایش خوێندی بە شادی
گۆرانی خۆشی ئاشتی و ئازادی

بەرگی مەینەتی لە بەرما دەدڕم
گەردی ماتەمی لە دڵما دەسڕم

دەچمەوە شاری شیعر و جوانی،
دەژیم بە خۆشی و بە کامەرانی!!

# بەهارم(*)ڕۆ

هەولێر ١٩٦٩/٧/٦

شکوفەی تازە پشکووتووی گوڵی سووری بەهارم ڕۆ
دووچاوی نێزگزی سیحراوی پڕ نووری بەهارم ڕۆ!

گوڵاڵەی ناسك و پاراوی گوڵزاری بەهارم ڕۆ
کچی نەورۆزی شۆخ و شەنگ و نازداری بەهارم ڕۆ

رەوانی بێ گوناهی بولبولی زاری بەهارم ڕۆ
بەهاری خۆشەویستی باوکی غەمباری بەهارم ڕۆ!

---

(*) بەهار: کچی تاقانەم بوو لە ١٩٦٩/٧/٤ دا بە کارەساتی ئۆتۆمبێل گیانی لە دەست دا.

## هەر بۆ شیوەنی بەهار

هەولێر تەمووزی/١٩٦٩

پەپوولەی پاکی گوڵزارانم ڕۆ
ئەستێرەی بەختی دڵدارانم ڕۆ

خونچەی پاراوی سەر چڵانم ڕۆ
جگەر گۆشەکەی ناو دڵانم ڕۆ

بولبولی شەیدای گوڵستانم ڕۆ
کۆتری بەهەشتی نیشتمانم ڕۆ

پرچی زێڕین و چاوی جوانم ڕۆ
لێو و ڕوومەتی ئەرخەوانم ڕۆ

ئاوازەی شادیی غەمبارانم ڕۆ
تانەی سەرچاوی نەیارانم ڕۆ

لابەری دەرد و ئێش و ژانم ڕۆ
سەرچاوەی شیعری بوێژانم ڕۆ

خەیاڵی خۆشی سەر مەستانم ڕۆ
خەمڕەوێنەوەی دڵ پەستانم ڕۆ

گوڵی سۆران و بادینام ڕۆ
(بەهار)ی کورد و کوردستانم ڕۆ

## دوێنی و... ئەمڕۆ

هەولێر ١٩٧٠/١/١٧

ئەو ڕۆژە سەر بەرز و شادبووم
کە ئازاد بووم
خۆم سەرداری باری خۆم بووم
مشوور گێڕی
کاری خۆم بووم
فەرمانڕەوا کار بەدەست بووم
من میللەتێکی سەربەست بووم
بە خۆشەویستیی وڵاتم
شاد و مەست بووم!!
خاوەنی ڕۆڵەی هێژابووم
پشت ئەستوور و دڵنیا بووم
سەلاحەددینم پاشا بوو
تۆقێنەری خاچیەکانی
ئەوروپا بوو
سەرداری دین و دنیا بوو
مەستی شانازیی ژیان بووم

شادمان بووم
خاوەنی موڵکی بابان بووم
خاوەنی ئەوڕەحمان پاشاو
کەریم خان بووم
من خاوەنی کۆر پاشای
میری سۆران بووم
خاوەنی قازی نەمر و
شێخ مەحموودی قارەمان بووم
من خاوەنی تەخت و بەخت بووم
خاوەنی ئاڵاو نیشان بووم!!
**
بەڵام ئەمڕۆ ڕۆڵەکانم
زادەی جەرگ و دڵ و گیانم
ئەی دلێرانی نەبەردی
کوردستانم
هەر چەند دوێنێ
ئێمە وابووین

خاوەنی ڕۆڵەی بەجەرگ و
شارەزابووین
نابێ بڵێین:
((وا بووین وابووین
خاوەنی سەلاحەددین و
کۆر پاشا بووین
خاوەنی ئافرەتانی وەك
قەدەم خێر و
خانزادی میری سۆران بووین
خاوەنی دوکتۆر فوئاد و
شۆڕشگێری
وەك شێخ سەعیدی پیران بووین!))
دەبێ بڵێین: ((وابین وابین
خاوەنی ڕۆڵەی دانابین
هەموو یەك دڵ وەك برابین
یەك مەبەست و یەك هیوا بین
بە دڵسۆزی

سەربازی ڕێی تێکۆشان بین
کۆکەرەوەی پارچەکانی
کوردستان بین
لە کاروانی پێشکەوتنی میللەتاندا
شان بە شان بین
بولبولی ئازادی باخی
نیشتمان بین
لە ناو بەهەشتی ژیاندا
شادمان بین
کامەران بین!!

## وتەی هەژارێک

هەولێر ١٩٧٠/١/١٩

بۆ گشت فەرمانێك
من گەردن کەچم
لە هەرکارێکدا
من تێ هەڵدەچم
بۆ بنێینەوە پیلان و گێچەڵ
بۆ کوڕ و کچم؟!
بۆ پیشێل بکرێم
بە ندبێ دەست و پێم
بە کۆت و زنجیر؟
پشتم بۆ قەمچی دەستی زۆرداران
ببێ بە نێچیر؟!
خەڵکی تر بۆچی نان و ژیانی
هەر شاهانەبێ
(نان ئەو نانە)ی من
هەر نانە وشکی بەندیخانەبێ؟
خەڵکی تر جێگەی
ناو کۆشك و سەراو
بەهەشت و باخ بێ!

بۆچی جێگەی من دەبێ ئەشکەوت و
ناو شاخ و داخ بێ؟
پۆشاکی خەڵکی
خوری و ئاوریشم و
مەرەز و شاڵ بێ
بۆچی پۆشاکم
کۆنە فەرەنجی و پەڕۆ و پاتاڵ بێ
**
خەڵکی تر هەرچەند مایە و قازانجیان
پارەو سامان بێ
مەرج بێ مایەی من هەر فیداکاریی و
هەر تێکۆشان بێ
تاکو مافی خۆم دەهێنمە دەستم
لە ڕێی خەباتداهەرگیزاو هەرگیز
من ڕانەوەستم!!

# ڤیەتکۆنگ

پێشکەشە بە شۆڕشگێڕەکانی ڤیەتکۆنگ لە وڵاتی ڤیەتنام دا

هەولێر ١٩٧٠/٢/١٠

بپرسن لێم
لە تێکۆشان و باوەڕم
لە ڕێ و جێم
بزانن کێم؟
من شاگردی بیری بەرزی
سەرەك (هۆ)مە
قارەمانی قەڵای سەختی
(بیان فۆ) مە
شوورای قورقوشم و پۆڵامە
لە پێش ئۆردووی هێزی دوژمن
من پڵنگم، ئەژدەهامە
ئیزرائیلی چڵکاو خۆرانی
سایگۆنی ئاڵقە لە گوێی
کۆڵۆنیالی ڕۆژئاوامە
لە دانانگ و لە گشت لایە
سەرکەوتوومە دڵنیامە
**

دەتانەوێ بزانن کێم؟
بپرسن لێم
لە تێکۆشان و کوشتارم
لە ڕێ و جێم
من دۆستی ڕاستی گەلانم
پشتیوانی تێکۆشانی
میللەتانم
دۆستەکانم
تێکۆشەری قارەمانن
هاو پەرژەوەندی خەباتی
ڕێی ژیانن
لە گشت لایەکی جیهانن
لەسەر لووتکەی چیاکانی
کوردستانن
لە ناو خاکی فەلەستینا
چەك بەشانن!!
**

دۆستەکانم گەلی ڕەقن
وەك پۆڵانە
لە گشت لایەکی دنیانە
لەناو دارستانەکانی
ئەفریقانە
لە ئەمریکا
لە ناو کارگەو کێڵگەکانا
شاگردی ڕاست و دڵسۆزی
گیڤارانە!!
**
بپرسنب لێم
بزانن کێم؟
من سەربازی
سەرك (هۆ)مە
بۆ سەرکەوتن هێز و هۆمە
بۆ دوژمنان
بۆمبای مەرگ و ترس و سامم
من هێزی ڕزگاریی خوازی

ڤیەتنامم!!
زادەی باوەڕی ڕووناکی
کۆنگرەی بەرزی باندۆنگم
((ڤیەتکۆنگ))م

# زەنگی ئاشتی

هەولێر ١٩٧٠/٣/١١

برای هاوڕێم
گوێ بگرە لێم
هەر چەند ئەمڕۆ
لای من و تۆ
جەژنە! سەیران و ئاهەنگە
جەژنی خۆشیی
چەوساوەی پەست و دڵتەنگە
دنیا بە جارێ خەملێوە
ڕەنگاو ڕەنگە
دوژمنی ڕوو ڕەش لە داخا
گەردن کەچە، زمان لەنگە
لە هەر لاوە بانگی شادی و
دەنگی زەنگە!!
دەنگی زەنگی ئاسایشە
وڵات هەمووی
ڕازانەوە و ئارایشە
ڕۆژی جەژنی ئۆتۆنۆمی

گەلی کوردە
جەژنی هەموو ئینسانێکی
ڕۆشنبیری ئازاو مەردە!!
**
بەڵام هاوڕێم
هاوڕێی بەرزی بەڕی و جێم
ئینسانی پیاو
تێۆکشەری خوین گەرمی لاو
نابێ بڵێ: ((ڕیگام بڕی
فرمانی سەرشانم تەواو!!))
ئێستا گەلێ
ڕێگەی دوورمان ماوە ببڕین
پەردەی تاری براکوژی
لەسەر شانۆی دڵمان بدڕین
فرمێسکی سووری ماتەممان
بۆ شەهیدانی کوردستان
بسڕێن! بسڕین!!

با زووی ڕەنج و هێزی زانین
بەکاربێنین
دامەزرێنین!
بنکەی زۆر قایم و سەختی
قەڵاو تەلاری خۆش بەختی
هەر وەك گەلانی کامەران
لەناو باخی شادیی ژیان
وەك بولبولی
شەیدای گوڵان
بە باڵ بفڕین
دەس لە مل غونچەی هیوا کەین
گۆرانی ئازادی بچڕین!!

# دەساڵی خوێناوی

١٩٧٠/٣/١٤

ماوەی دە ساڵی خوێناوی
دە ساڵی شەڕ
دە ساڵی پڕ کارەساتی ئاگراوی
لە پێناوی
خاکی کوردستان و ناوی
لە گوڕەی بەهاری تەمەن
لێمان وەری غونچەی لاوی!!
لە دە ساڵی سەخت و دژا
خوێنی ڕۆڵەی کوردی نەبەز
گەلێك ڕژا
گەلێ نازداری شۆخ و شەنگ
بە گوللەی شەستیر و تفەنگ
مێشکی پژا!!
میللەت بە جارێ شڵەژا
**
دە ساڵی پڕ لە کوستن و بڕانەوە
لە شانۆی کوردستانەوە

زنجیرەی ئەم کارەساتە و
ئەم کوشتارە
بۆمان دەکراوە دووبارە
تاکو دوێنی کۆڕی نەبەرد
کێو و هەردی کوردستان بوو
دۆزەخی بۆمبا و ئاگری
بێ ئەمان بوو
پێ شێڵگەی ڕەورەو شڕەی
ئۆدوگای هێزی شەیتان بوو
کوردستانم
بۆ خۆمان و بۆ دوژمنان
گۆڕستان بوو!!
**
دە ساڵی تاریك و نووتەك
دە ساڵی شەو
ئێمەی چەك بە شانی نەبەرد
ئێمەی پێشڕەو
نە دەسرەوتین

چاوی گەشمان نەدەچووە خەو
نەمان دەدی
لە هیچ کەلێ
لێمان هەڵێ
ڕۆژێکی نەو!!
تاکو لە یانزدەی ئادارا
وەك سەردەمی کاوەی کارا
بە ئارەزووی هەموو دڵێ
بە هەوەسی گشت بولبول و
غوچە گوڵێ
لە هەندرێن و هەڵگوردەوە
لە بەندەنی وڵاتەوە
زۆر بەگەشی هەتاوی کورد
هەڵاتەوە!!
تیشکی زێڕینی پەخشان بوو
کوردستان ڕۆژی هاتەوە
شەوی ژینی تەنگ و تارمان لێ بەسەر چوو
بوو بە نەورۆزی پیرۆزی
پڕ ئاوت و پڕ ئارەزوو

نەورۆزی مرۆڤایەتی
جەژنی ئاشتی و برایەتی
باهووی چەك و دەستی كوشتن
بوون بە بازووی
دەس لە ملان و ڕوو ماچ كردن
ئاڵای ئاشتی بەسەرمانا
شەكایەوە
دۆستایەتی كورد و عەرەب
ژیایەوە!
ئەم ڕووداوە
وەكو زەنگی سەرفیرازی
لە گشت لایەكی جیهانا
زایەڵەی دەنگی دایەوە!!

## من و تۆ

هەولێر ١٩٧٠/٣/٢٣

من و تۆ هەردوو
پێشمەرگەی خاکی
کوردستانێك بین

هەردوو سەربازی
ڕاست و دڵپاکی
قارەمانێك بین

ڕۆڵەی دلێری
کوڕی نەبەردی
نیشتمانێك بین

خاوەنی مێژووی
گەشی بێ گەردی
تێکۆشانێك بین

زۆر نەنگە بۆمان
ئەمڕۆ سەرخۆشی
مەی سەرکەوتن بین

یەك لەگەڵ یەكدا
وا بە ناخۆشی
دەستەو گەردن بین

دڵ خۆشكەرەوەی
دڵی پڕ داخی
دەستەی دوژمن بین

پێویستە تا سەر
لە تێكۆشانا...
هەر شان بە شان بین

لەسەر ڕێبازی
سەختی ژیانا..
ئالا و نیشان بین!

## دەتانەویست

هەولێر ١٩٧٠/٣/٢٥

ئەی دەستەی کۆنەپەرستان
ئەی دوژمنانی کوردستان
ئێوەی بەد خوو
ماوەی دە ساڵی ڕابوردوو
لێمان بوو بوون
بەگورگی بیرو بڕوامان
بە کرمی ناو جەرگ و دڵی
پڕ هیوامان
ئێوەی زەروو
خێرو خۆشی کوردستانتان
خستە گەروو
لێتان مژین
خوێنی گەش و گوڵاوی ژین!!
لەسەرەتای شۆڕشەوە
تاکو ئەمڕۆ
دەتانەویست هەر بە درۆ
بە فیشاڵ و وتەی زل زل

لەسەر لووتکەی  خەباتەوە
هەڵمان دێرێنن تەپا و تل!!
دەمی تیغی بەدکاریمان
بخەنە مل
دەتانەویست تا هەتایێ
بەند کراو بن دەست و پێمان
دەنگی بولبولی ئازادی
هەرگیز نەگاتە بەر گوێمان
هەواڵی سەربەستی گەلان
نەگا پێمان!
واتان دانابوو لە مێشك و
بیری خۆتان
لەناو فەرهەنگی درۆتان
بەشمان دەبێ
هەر بەندیخانەو زیندان بێ
هەر ئەشکەنجەو
چەرمە سەرێ و تێهەڵدان بێ
**

دەتانەویست پاشی دەساڵ
دە ساڵی پڕ دەربەدەری و
ماڵوێرانی
نەچێژین تامی ئازادی و شادمانی
کۆڕی شایی و زەمانەندمان
پێ بە تاڵ کەن
جەژنی شادی و کامەرانیمان
لێ تاڵ کەن
کۆرپەی نازی هیوامان
زیندە بە چاڵ کەن
دەتانەویست
لێمان ون کەن ڕاستەڕێمان
تێکدەن لێمان
ڕێکو پێك تێکۆشان و
ڕێ و جێمان
بەڵام ئێمەی
دیتەی هەزاران کارەسات
قاڵ بووەوەی ناو بۆتەی خەبات

ئێمەی گەلی کوردی هەژاری چەوساوە
بەرامبەر بە جووڵەی دوژمن
هەموو لەشمان
گوێ و چاوە!!
هەنگاوێکی زلمان ناوە
پێمان لە خاکی خەباتا
داکوتاوە
هەڵوێستمان ڕاست و تەواوە
هاتووینە پێش
هەرگیز ناچینەوە دواوە!
گەیشتووینە یەکەم مەبەست
ئۆتۆنۆمی کوردستانمان
خستۆتە دەست!!

# شەهیدی کورد

هەولێر ١٩٧٠/٣/٣٠

من لە ڕۆژانی گرمەو هارژنی
شۆڕشی میللەت
خوێنم ڕژاوە!
لە ژێر بەیداغی کوشتار و هەڵمەت
مێشکم پژاوە!!
بە بۆمبای دوژمن!
گەییوتە قوڕگم
پەنجەو نینۆکی چەپۆکی مردن
سووتاوە وەك مۆم
لەش و لارەکەم
بە گڕی دارو پەردووی شارەکەم
کوتراوە کەلەم،
ئەندامی لەشم
لەبن ڕەوڕەوی تانك و زرێدار
بۆتە پێشێلگەی
دوژمنی خوێنخوار!!
**

شەهیدی کوردم
هەرگیز نامرێ ناو ونیشانم
هەروەك دڵنیام
باز رەقەی تیژی
خوێنە سوورەکەی خۆم و دۆستانم
لەسەر بەندەنی
ڕێی تێکۆشانم
دەبێ بە تیشکی
سپێدەی گەشی
ڕۆژێکی جوانم
بۆ کوردستانم!!

# شیوەنی بیلال[*]

کۆیە ١٩٧٠/٥/٢٥

ئـــەمجارەش کارمـــان لـــە کـــار تـــرازا
بـــوو بـــە شـــیوەنی کـــاك و بـــرازا

هەرچەنـــدە مانگمـــان بەختـــە بارانـــە[١]
کـــەچی بـــەختمان هـــەر لـــە گریانـــە!

لەهـــەر لا شـــینەو گریـــە و فیغانـــە
ڕۆ ڕۆی یارانـــە، فرمێســـك بارانـــە

دنیامـــان دنیـــای لێـــك دابڕانـــە
بـــۆ پیـــاوی ئـــازا مـــردن ژیانـــە!

کۆســـتی کـــەوتوومان کۆســـتی دڵانـــە
کارەســـاتێکی گـــەورەو گرانـــە!

---

[*]مامۆستا بیلال بەهائەدین تەیب، دۆستێکی گیانیم بوو، لە ١٩٧٠/٥/٢٣ دا پاشی تێکۆشانێکی دوور و درێژ بە نەخۆشی شێرپەنجەی گورچیلە کۆچی دوایی کرد.

[١] خوا لێ خۆش بوو لە مانگی بەختە باران (جۆزەردان) کۆچی دوایی کردووە.

کۆچی یەکجاری کاکە بیلالە
ئەو تێکۆشەرەی وەك گڕی لالە

بۆ خۆی دەسووتا و شەوقی دەبەخشی
ناخۆشی بۆ خۆی بۆ میللەت خۆشی

مامۆستای ڕاستی درشت و وردبوو
ڕێ نیشاندەری نەوەی نوێی کورد بوو

ئازادیخواز و ئاشتی پەروەر بوو
لە تێکۆشانا ڕاست و ڕابەر بوو

باوەڕی تیژی تییر و خەنجەر بوو
بۆ چاوی دوژمن نێزە و نەشتەر بوو

تەرمی بیلالی مەرد و ڕەوشت چاك
هەرچەندە ئەمڕۆ دەخرێتە ژێر خاك

بەڵام پڕشنگی باوەڕی پاکی
هەر دەمێنێت و دەدا ڕووناکی!!

لـــــه ژێــــر ســــێبەری ئاشـــــتیا
مەســـــتی شــــەربەتی شـــــادیمە
لـــــه ســــــایەی خۆشەویســـــتیا
سەرخۆشـــــی مــــەی ئازادیمـــــە(*)

(*) ئـەم چوارینەیـە لـە کۆمەڵـە شـیعری ڕێگـەی دوور کـە لـە دوا لاپـەڕەدا بڵاوکرایتـەوە نـە ناونیشانی بۆ دانراوە و نە بەرواری لەسەر نووسراوە ئێمە بەباشمان زانی وەك خۆی چاپی بکەینەوە (ك. ك. شارەزا).

## شۆڕشگێڕێک

هەولێر: ١٩٧١/٢/٢٠

زەردەشتێکە
ڕێبەری ڕێی بەهەشتێکە
پەیامبەری
ڕاستگۆی ئاهوورە مەزدایە
بیرو بڕوای
بەندەکانی ئاوێستایە!
کاوەیەکی قارەمانە
پیاو چاکێکە
ڕووخێنەری تەخت و بەختی
دە ئاکێکە!!
دەست و بازوو بەهێزێکە
دڵسۆزێکە
کۆنە ڕووخێن
داهێنەری نەورۆزێکە!
سپارتا کۆسە
قارەمانی کۆیلەکانی

بەدبەختی شاری ڕۆمایە
لەبەر چاوی دوژمنانی
کێوی بەرزی هیمالایە
خەباتگێڕێکی دلێر و
سەرفیرازە
شەڕکەرێکی ئاشتیخوازە
عیساییێکە
ڕزگارکەری دنیاییێکە!
هەق پەرستە
بۆ بەرژەوەندیی زۆرداران
بەرهەڵستە
هەللاجێکە
هەژێنی تەخت و تاجێکە!!
**
بۆ کوردستان کرۆموێلە
ڕۆبسپیری فەرەنسایە
هۆشی منەو جیڤارایە

شۆڕشگێڕێکی بەسام و
تا بڵێی بەرز و باڵایە!
لە ڕێی ئازادی میللەتا
زۆر بە جەرگ و شارەزایە
دژی دیلی و ژێر دەستییە
ڕۆڵەی میللەتێکی تێنووی
سەربەستییە
شەڕکەرێکی مەچەك پۆڵای
ئاگری داغە
خاوەن ماڵێکی وێران و
نشتمانێکی بەر بادە!!
تارمایی دکتۆرفوئادە
گیانی یاخی
شێخ سەعیدی جاویدانە
سەربازێکی ئاو بارێك و
شەڕی دەربەندی بازیانە
جێ نشینی

شێخ مەحموودی قارەمانە
پێشمەرگەیەکی هەندرێن و
کورەك و هەیبە سوڵتانە
هاورێی قازیی نەمرمانە
تۆڵەسێنی شەهیدانی
مەهاباد و حوزەیرانە
بارزانی یە مەزنترین قارەمانە
هیواو ئاواتی
دوا رۆژێکی یەگجار گەشی
کوردستانە!!

# تابلۆی هەڵبەستم

هەولێر ١٩٧١/٧/٦

سەرچاوەی ئیلهامی شیعرم
هەتا دەژیم هەتا دەمرم
خوێنی سووری شەهیدانی
ڕێگەی دووری تێکۆشانە
لوولەی تفەنگی پیشمەرگەی
ڕێی ئازادیی کوردستانە
چەکی دەستی فیداکاری
ڤیەتنام و فەلەستینە
تێکۆشانی
میللەتانی
ڕووی زەمینە!
خامەی گۆرکی و
ئاوازەی شیعر لۆرکایە
پەتی سێدارەی تانیایە
گیانی پاکی شەهیدانی
حوزەیران و چوار چرایە
شۆڕشگێڕیەتی
خەباتی گیڤارایە

تێکۆشانی لۆسەر گینگ و
ئەنجیلایە!!
**

لەم هەموو سەرچاوانەدا
بۆ هەوێن و مورکی شیعرم
هێز و ئیلهام وەردەگرم
لە چوارچێوەی
دنیای ئەندێشەی سەربەستم
ئەم دەنگانە
ئەم ڕەنگانە
دەڕنم، دەچنم
دەتوێنمەوە
لە ناو بۆتەی هۆش و هەستم
تا ئەیکەمە
زەیتی سەر فرچەی بەردەستم
بە وەستایی پێی دەکێشم
تابلۆی هەڵبەستی مەبەستم

تابلۆیەك بێ
لە جوانی دا وەك گڵووكی
لاجان و دەشتی هاموون بێ
لە ورشەدا
ئەستێرەكانی گەردوون بێ
لە ناسكی
نێرگز و لالە و چنوور بێ
مانای بەرزی
شەپۆلی دەریای ڕووناكی
بێ سنوور بێ
یەكگرتوو بێ بەندەكانی
ڕێكو جوانی
وەك كوردستانی پاشە ڕۆژ
لێی ببارێ كامەرانی
پەرستگا بێ
بۆ ئەندێشە و بیرو هەستم
سیحراوی بێ
وەكو نیگای چاوی مەستی
خۆشەویستم

## زۆرانبازیی

هەولێر ١٩٧٠/١٢/٣٠

دوژمنەکەم
بە کردار و واتەی درۆت
وا مەزانە باوەڕ دەکەم!
**
لە فەرهەنگی
بیرو بڕوای ناهەموارت
لەبەر نیگای
چاوی چەوتی خێڵ و خوارت
تاکەی ڕاستی سەرەو بن بێ
سپی ڕەش و
دۆست دوژمن بێ
سەرەتامان کۆتایی بێ
ئەنجامی هەوڵ کۆششمان
ڕیسوایی بێ!؟
شەڕمان خێر بێ
ناکۆکیمان تەبایی بێ
ڕەنجی شانمان
بێ هوودە بێ

ماندوو بوونمان خۆڕایی بێ!
دوژمنەکەم
بە کردار و واتەی درۆت
وا مەزانە باوەڕ دەکەم!
**
دوژمنەکەم
تاکەی لە ژێر باڵی ڕەشی
فەرمانی تۆ
لە ناو شوورای زیندانی تۆ
ڕۆژمان شەوی تەنگو تار بێ
سەرەداوی چارەنوسمان
ئاڵووزاوی و نادیار بێ!
ڕێگامان پڕ مەترسی بێ
زارمان وشك و
زگمان گوشراو و برسی بێ
گوێمان کەڕ
زمانمان لاڵ بێ!
وشەی نێو دەمی گیراومان
کرچ و کاڵ بێ!

دەروونمان تێنووی شادی بێ
بیرو باوەڕی برسیمان
هەر تامەزرۆیی ئازادی بێ
دوژمنەکەم
بە کردار و  واتەی درۆت
وامەزانە باوەڕ دەکەم!
**
دوژمنەکەم
تاکەی تاکەی
ئاوەدانیمان خاپوور کەی ؟!
گیانمان قڕکەی
تاکەی خوێنی گەشمان فڕکەی
گەنجینەت لە زێڕ و زیو و
دۆلار پڕکەی؟!
سەرمان کاس کەی
بیرمان سڕکەی؟
دوژمنەکەم

بەکردار و واتەی درۆت
وامەزانە باوەڕ دەکەم
*
دوژمنەکەم
من ڕابوردوو پەرست نیمە
بە پاشە ڕۆژ باوەڕ دەکەم
گوێ ڕایەڵ نیم بۆ فەرمانت
یاخیمە لێت
نام ترسێنن پۆستاڵی پێت
زرەی زنجیری زیندانت!!
بە چەکی بیرو باوەڕم
بە دڵ بە گیان
تێدەکۆشم
ڕێی تێکۆشان
ڕێگەی خوێن و وقوربانییە
ڕێی سەرکەوتن
ڕێی ژینی کامەرانییە

مێژووی خەبات
بە دەنگێکی زوڵاڵی پڕ لە شانازیی
پێمان دەڵێ:
ئەنجامەکەی زۆرانبازیی
بۆ تۆ مردن
بۆ من شەڕابی سەرکەوتن
دوژمنەکەم
ئەمن تەنیا بەم ئەنجامە
باوەڕ دەکەم

# کچی نەورۆز

هەولێر ١٩٧٢/٣/٢

کچی نەورۆز
ئەی سەرچاوەی
بیرو ئەندێشەی سەربەستم
چاوگەی پاکی
هۆش و هەستم
بێ تۆ گیانە
لەم بەهەشتەی کوردستانە
ژینم ئەشکەنجە و ئازار بوو
ڕۆژی ڕوونم
شەوی پەستیی تەنگوتار بوو
وەرزی عومرم
هەر زستان بوو
گەرداو و تۆف
کرێوە و بەفر و باران بوو
دڵم دۆزەخ
دنیای ئاواتم زیندان بوو
**

بەڵام ئەمڕۆ
ئەی پەری پاك و پیرۆزم
کچی شۆخ و نازداری
بابە نەورۆزم
کە تۆ هاتی
نەما دەرد و قڕ و قاتی
بوو بە نەورۆز
بوو بە جەژنی خۆشی و هاتی
چاوگەی ژینم ژیایەوە
بەفری غەمی دڵی سڕم
توایەوە
گوڵی هیوام گەشایەوە!
بە پێکەنینی سیحراویت
بولبول خوێندی
خونچە دەمی کرایەوە
بە تریفەی کوڵمی گەشت
بە ڕەنگی پەرچەمی ڕەشت
دنیای سروشت ڕازایەوە

لە جوانی ڕووت
نەرگز پشکووت
لە ترپەی پێت
تەلیَ کەمان کەوتە لەرزین
بوو بە ئاهەنگ و هەڵپەڕین!
**
لێوی ئاڵت
بوو بە گوڵاڵەی دەشت و کێو
بوو بە ڕەنگی ڕوومەتی سێو
چاوی کاڵت
بوو بە چاوی شەهێن و باز
بوو بە سەرچاوەی سیحر و ناز
پرچی خاوت
بوو بە ڕیشوەی گیابەند و خاو!
**
کچی نەورۆز
گیانی شیرین
زەریا، زەمین

ئاسمانی شین
هەرچی هەیە و کە دەیبینین
هەمووی زادەی
جیلوەی سیحری جوانی تۆنە
ئەی نازەنین!
ئەی سەرچاوەی بەهرە و جوانی
تا دەتوانی
داباریێنە بەسەرماندا
خێر و خۆشی و کامەرانی
بۆمان بینە بەدەست و برد
مژدەی ئازادیی
گەلی کورد !!
**
نازدارەکەم
لام ڕووناکە هەرچی بکەم
ناگەم بە تۆ
تۆ فریشتەی جاویدانی

پڕشنگی ڕوناکی و جوانی
سیحری بەهرەو
هێزی گیانی
من گۆشت و خوێن ئیسقانم
من ئینسانم
ڕێبوارێکم دێم و دەڕۆم
لەم دنیایەدا میوانم
ئەندامی کاروانی ڕێگەی
تێکۆشان و بەر خودانم
تێشووی ڕێمە
خۆشەویستی ی کوردستانم
لەسەر دەستمە
دڵ و گیانم
لە پێناوی کامەرانی و
سەرفیرازی نیشتمانم!!

## وامانزانی

هەولێر ١٩٧٩

وامان زانی
داگیرکەرمان لە ناو دەرچێ
ئازاد دەبین
وامان زانی
پاشایەتی بڕووخێنین
سەرفیراز و دڵشاد دەبین
وامان زانی
دەرەبەگ و سەرمایەدار
لەناو بەرین
دوور دەبین لە چەوسانەوەو
ئێشو ئازار
دەکەوینە
دنیایەکی پڕ هێمنی
دەژین ژینێکی بەختیار!!
**

نەمان زانی
ئەوەی دوێنێ
خۆی کردبوو بە برامان
بەهێز و پشت و پەنامان
بە هەڤاڵی
بەرەی خەباتی هاوبەشمان
بۆ گەیشتن
بە هیواو ئاواتی گەشمان
لێمان دەبێ بە داگیر کەر
بە خوێن مژ و بە چەوسێنەر!
دەبێت بە گورگێکی برسی
بە دوژمنێکی چنگ بە خوێن
ژن و منداڵ
گەورەو بچووك هیچ ناپرسی
هەرچی بکەوێتە چنگی
بە بێ دەنگی
وەك ئەژدەهاك

مێشك و کەلـلـەی هەڵدەلووشێ
خوێنـی دەکاتـە کاسـەوە
بـە خۆشی و و شادی دەینۆشێ
**
بۆیـە ئێمـە
تـا داگیرکـەری نـاوخۆمان
لـەنـاو نـەبـەین
ئـازاد نـابین
تـاکو شای تـازە
گۆر نـەکـەین
سـەرفیراز و گوشـاد نـابین!!!

# دایک

مایەی شادیی ژیانم
دایکی دڵ میهرەبانم

خۆشەویستی دڵانم
پارێزەری گیانم!

پاسەوانی شەوانم،
مایەی ژیان و مانم

تۆی فرشتەی ئاسمانم،
دایەی شیرین و جوانم!

# باوەڕ ناکەم

هەولێر ١٩٧٢

ئەگەر بڵێن
باوەڕ دەکەی ئینسانی کورد
ڕۆژێك دابێ و دروست بکا
مانگی دەسکرد
لە نێوانی ئەستێرەکانی ئاسمانا
بێ و بچێ و بنیات بنێ
شەقام و پرد
بفڕێ بەناو
گوڵزارەکانی گەردوونا
بچنێ بۆمان
غونچەی هەزاران بیری ورد
دەڵێم: ڕاستە باوەڕ دەکەم
کورد زیندووە و باوەڕم کرد
بەڵام هەرگیز
باوەڕ ناکەم
ئەگەر بڵێن خۆشەویستیی
کوردستانت
لە دڵدا مرد!!

# ئەگەر بڵێن(*)

هەولێر ١٩٧٩/٢/٢٠

ئەگەر بڵێن باوەڕ دەکەی؟
لە نەورۆز و نەو بەهارا
لەو کاتەی کە بەفری کەژان
دەتوێتەوە
سەهۆڵبەندان دەکرێتەوە
هەموو شتێ سەوز دەبێ و
دەژییێتەوە !!
ئەگەر بڵێن لەو کاتەدا
چیتر نێرگز
لە باوەشی نێرگزە جار
هەڵناهێنێ چاوی زەردی
مەست و خۆمار
چرۆ دەمی ناکاتەوە
گوڵاڵە سوورە ناڕوێ
شکوفەی گوڵ پێ ناکەنێ
وە نەوشەی مەست ناپشکوێ

---

(*) ئەم هۆنراوەیە لە میهرەجانی دووەمی شیعری کوردی لە سلێمانی لە ڕۆژی ١٩٧٩/٣/٢٩ دا خوێنرایەوە و لە ژمارە (٥)ی خولی دووەمی ساڵی ١٩٨٠ی گۆڤاری نووسەری کورد دا بڵاوکراوەتەوە.

دەڵێم ڕاستە
باوەڕ دەکەم!!
**
ئەگەر بڵێن باوەڕ دەکەی؟
ڕۆژێك دابێ
هەوری بەهار نەگرمێنێ
چیتر لووتکەی چیاکانمان
نەگرێتە خۆ
ڕێژنەی سەوزی زیندەگانی
بەسەر دەشت و کێڵگەکاندا
نەبارێنێ!!
دەست و پەنجەی سروەی شەماڵ
چڵی چنار و شۆڕە بی
بە ناسکی نە هەژێنێ!
هاژەی بە فراوانی کوێستان
دڵی کەس دانە خورپێنێ
شەونم بەرگی گوڵ تەڕ نەکا

بولبول بۆ غونچە نەخوێنێ
دەڵێم ڕاستە
باوەڕ دەکەم!!
**
ئەگەر بڵێن: باوەڕ دەکەی؟
مەل هێلانەی خۆی تێك بدا
بێچووەکانی  بفەوتێنێ
دایك کۆرپە تاقانەکەی
بە دەستی خۆی بخنکێنێ!!
پێوانەی چاکەو خراپە
بە یەکجاری لە ناو بچێ
ڕاسگۆ ڕاستی بدۆڕێنێ
دەڵێم ڕاستە باوەڕ دەکەم!
**
ئەگەر بڵێن: باوەڕ دەکەی
پەپوولە باڵ ڕەنگینەکان
لە گەرمەی  وەرزی بەهارا

چیتر بە ناو گوڵزاری جوان
هەڵنافڕن
پڕ بە دەم و بەکامی دڵ
چی تر سەر گۆنای پەڕەی گوڵ
ماچ ناکەن و هەڵنامژن
دەڵێم ڕاستە: باوەڕ دەکەم!!
**
ئەگەر بڵێن: باوەڕ دەکەی؟
هەنگ لە شانەی خۆی بتۆرێ
گوزەر نەکا
بەناو بەیبوون و گوڵاڵان
مان بگرێت و
چیتر هەنگوین دروست نەکا
نەمژێ تام و بۆی هەڵاڵان
دەڵێم: ڕاستە باوەڕ دەکەم!!
**
ئەگەر بڵێن: باوەڕ دەکەی

کۆرپەی ساوا
لە کۆش و باوەشی گەرم و
لە مەمکی دایکی بتۆرێ؟
مەم لە زین ڕوو وەربگێڕێ
فەرهاد شیرینی ئەوێت و
سیامەند لە خەج دڵ بگۆڕێ!
باوك ڕۆڵەی خۆی بە کوشت دا
دایك شایی بۆ بگێڕێ!!
دەڵێم: ڕاستە، باوەڕ دەکەم!
**
ئەگەر بڵێن: باوەڕ دەکەی؟
رۆژێك دابێ ئەستێرەکان
لە نێو زەریای پیرۆزەیی
ئاسمان جوان
بتوێنەوە
چی تر پڕشنگی فێنکیان
بۆمان نەیێ و نەجریوێنن

لە خولگەی خۆیان لابدەن
هاتو چۆیان بوەستێنن!!
دەڵێم ڕاستە
باوەڕ دەکەم!
**
لەم گەردوونە سەر سوڕمێنە
فراوانە
لە ناو بۆتەی ئەم جیهانە
هەرچی هەیە
کە دەیبنین، کە دەیبیستین
هەموو شتێ  لە گۆڕانە
بەڵام ئەوەی
باوەڕ ناکەم بگۆڕێت و بتوێتەوە
لە نەخشەی جیهانی دڵما
بسڕێتەوە
خاکێکی تێنووی ژیانە
قاڵ بووی خەباتێکی سەخت و
تێکۆشانە!!

# سروودی شاری کۆیە

کۆیە ١٩٥٧

شاری کۆیە خاکی پاکی خۆش هەوار
تۆی بەڕاستی جەننەتی پەروەردگار
چەند جوانە دیمەنی باخ و ڕەزت
یاخۆ چاو ئەندازی میرگ و میرغواز

**

نەشئەی بەخشە دەیمەنی نەسرینی تۆ
دیمەنی لالەو وە نەوشەی چاو خومار
چەندە خۆشە باخ و سەیرانگاهی تۆ
ناوچەیی شادینە جێی گەشت و گوزار

**

کێوی قەشقەی جوانی قەد ڕەنگینی تۆ
هەیبە سوڵتانت بڵندەو سازگار
خۆشە سەرچاوەی حەماموك و چەمی
باخەکەی ئۆمەرخوچانی خۆش نیزار

**

لانەیی ڕۆڵانی کاوەی گوردی تۆ
نیشتمانی نەڕە شێرانی شکار
خۆشترین کوێستانە باواجی بەرز
خۆ چنارۆکە بەهەشتی کردگار!!

# گۆرانی بەهار

بەخێر بێی بەخێر ، بەخێر بێ ی بەهار
دنیا بەهۆی تۆ ، پڕە لە گوڵزار!

**

چەشنی بەهەشتە دەشت و دەرو شار
چەن جوان و سەوزن مێرگ و مێرغوزار
بنەوشەو لالە بەیبوون و گوڵنار
وا بووژانەوە کەوتنە لەنجەو لار
بۆ هەر لا دەچی وەرزیرو جوتیار
گۆرانی دەڵێن هەموو بەیەکجار
(بەخێر بێی بەخێر، بەخێر بێی بەهار
دنیا بەهۆی تۆ پڕە لە گوڵزار)

کۆترو کوناچەو بولبولی مەدهۆش
ئەمڕۆ دەخوێنن بە سۆز و لە جۆش
بەرانبەر گوڵی پاراوو تەڕپۆش
لەجیاتی بادە بە شەونم سەرخۆش
ئەوانیش دەڵێن بە دەنگێکی خۆش
(بەخێر بێی بەخێر، بەخێر بێی بەهار
دنیا بەهۆی تۆ پڕە لە گوڵزار)

مــــروٚڤ لـــــه خوٚشــــی بـــــههاری ڕهنگـــــین
شـــادو سهرمهســـــته ، دهم بـــــه پێکـــــهنین
بـــوٚ هـــــهرلا دهڕوٚی بهزمـــــهو ههڵپـــــهڕین
دڵ پـــاك بوٚتـــــهوه لـــــه ڕق و لـــــه کـــــین!
نـــــهماوه هـــــیچ دامـــــاو و غـــــهمگین
پێکـــــهوه دهچـــڕن دهســـــتهی شـــادیی ژیـــن
(بـــهخێر بێــی بـــهخێر، بـــهخێر بێــی بـــههار
دنیـــا بـــــههوٚی تـــوٚ پـــڕه لـــــه گـــولزار)!!

# له یادی حاجی قادری کۆیی دا

کۆیە هاوێنی ١٩٧٢

دە حاجی هەڵبڕە چاوێ
بەرەو شاری شەهیدانت

وەرە بۆ خاتری خوێنی
گەلاوێژ و حوزەیرانت

سەیرکە باغی سووتاو و،
هەزاران ماڵی وێرانت

بوەستە تۆ لە نێوانی
کە کۆن و هەیبەسوڵتانت

دەبینی هەر لە باواجی و
زرێبار و لە ئاشانت!

لە قوشخانە و قەلاٚت و با...
یزاغا، تا هەواوانت

هەمووی ڕەنگین بووە ئەمڕۆ
بەخوێنی سووری لاوانت!

# قوڵەی ڕانیە(*)

ڕانیە هاوینی ١٩٥٥

کەوسەرە ئاوی قولەی شیرین و سارد و سازگار
یا نەخۆ ئاوی حەیاتەو موعجیزەی پەروەردگار!

هێزی بزوێنی شعوور و بیرە بۆ پیر و جەوان
یا شەرابی پاکی فیردەوسەو خەڵاتی کردگار

چەند جوانە دیمەنی زیخ و چەو و بەردی بنی
کاتێ دەردرەوشێنەوە وەك زێڕی نێو نەخش و نیگار!

هێندە ساف و پاك و ڕوونە چەشنی ئاوێنەو بلوور
بڵقی زیوینی لە ناخی دێتە دەر زۆر نەشئەدار!!

چەندە خۆشە دیمەنی دامێنی ئێوارەو بەیان
وەك بەهەشتە پڕ لە حۆری شۆخ و شەنگ و چاو خومار

خۆشترین جێگەی زەمینە یانەیی سەر ڕۆخەکەی
فێنکە ئاو و هەواکەی دایما عەینی بەهار

قەدر و نرخی چەشنی ئاوی ژینی زۆر پیرۆز و پاك
قەت تەواو نابێ هەتا ئاخیر دەوامی ڕۆژگار!!

(*) قولە: سەرچاوەی ئاوێکی سازگارە لە ڕانیە، بە هاوینان یانەی فەرمانبەرانی لەسەر دەکرێتەوە.

# له نێو باخی بەختیاریی

کۆیە: بەهاری ١٩٥٧

یـــــاری شـــــۆخ و شـــــەنگ و نـــــازدار
پـــــــــــــەری ڕوخســــــــــــار
لێـــــو و گۆنـــــا یـــــا قـــــووتی ئـــــاڵ
گـــــــــــــەردن شمشـــــــــــــاڵ
ســـــینە بلـــــووری ســـــاف و لـــــووس
مـــــــــــەم ســـــــــــێوی کـــــــــــاڵ
بـــــالاَ نـــــەمامی شـــــل و مـــــل
پـــــــــــــرچ ســـــــــــــومبول
چـــــاو گـــــەلاَوێژی ڕوون و گـــــەش
گیـــــــــــانی شـــــــــــیرین
تـــــۆ وەرە بـــــا تـــــاوێ بـــــژین
لـــــە ژێـــــر ســـــایەی گـــــوڵزاری ژیـــــن
وەك بولبـــــول و غونچـــــە گـــــوڵ بـــــین
دەســـــــت لـــــــە مـــــــل بـــــــین
لـــــە نـــــاو بەهەشـــــتی دڵـــــداری
مەســـــــتی چریکـــــــەی ســـــــیحراوی

بولبولی کامەرانی بین

سەرسامی نەغمەو ئاوازی

شالووری شادمانی بین

سەر خۆشی پێکی خۆشی بین

دوور لە خەم و خامۆشی بین

بۆ خەوشەویستی خوڵقاوین،

لەنێو باخی بەختیاریی

بە شادی بژین تاماوین!!

# فلـــس

کۆیە ١٩٥٦

ئــەی فلــس هــەر تــۆی لـەســەد پـیلان و تــەگبیر چـاتری
کــاتی تەنگانـــە لـــەتانك و تــۆپ و شەســتیر چــاتری
لـــەم دەم و ســاتە لـــە وریـــا و عاقــڵ و ژیــر چــاتری

**((ئــەی فلــس وەڵــڵا لــە داك و بــاب و بــاپیر چــاتری**
**تۆ لـە دوو سەد خزم و خۆێش و شێخ و دەسگیر چاتری))**

**

ئەیکە یـە بیستان و باخچـە، کێوی وشك و عـەردی دێم
ئەیکەیـە کۆشك و تـەلاری بـەرزی جەننـەت ماڵ و جـێم
حـەز بکەی سـەد گـەنجی شاهی تـۆ دەخـەیتـە ژێری پێم

**((وازبــانم بـــێ ئـــەدەب نـــابم ئەگـــەر ئـــەمڕۆ بڵــێم**
**تـــۆ لوقمـــان و ئەرەســـتۆ عـــالیم و دانـــا تـــری!))**

**

من بە گوێی خۆم بسیتووە ئاشووب و فیتنەت کردە خێر
تەخت و بەختیشت گەلێ جار وەرگیراوە سەر وە ژێر،
هەندێ جاریش زۆر هەژاری ڕووت و برسیت کردووە تێر

**((من بە چاوی خۆم دەبینم کەمتیارت کر بە شێر**
**بەینی بەینەڵڵا لە خواجە و فەیلەسووف وریاتری))**

**

کەر سواری ترسنۆکت بردە ڕیزی شاسوار،
گەنجی زاناو لاوی دانات کردە پیاوی لار و خوار
زۆر کەسی بێ مێشك و گێژت کردە زاناو هۆشیار

**((کلکی کەر بەرز کەیتەوە ئەیکەی بە پێشەنگی قەتار**
**ئافەرین بۆ تۆ فلس بێ شك لە من دانا تری!))**(*)

**

(*) مەبەست لە دانان و پێنج خشتەکی کردنی ئەم هەڵبەستەی قانیع هاندان نییە بۆ پارە پەرستی، بەڵکو مەبەست ئەویە کە فلس (پارە) ئەمرۆکە لەلای هەندێ کەس بووەتە هەموو شتێك لە ژیاندا!!

## پور سەعید

کۆیە: پاییزی ١٩٥٦

ئــاگری بورکــانــی داگیــر ســاوی شــەڕ دەکوژێتــەوە
دەست و پێی زنجیر کراوی هەق پەرست دەکرێتەوە
بــەفری غــەمباری لــە ســەر کێـوی دڵان دەتوێتــەوە
مـژدە بـێ ئـەی پور سـەعیدی سـەر بڵـندی قارەمـان
وا سوپاکەی شوومی تاریکی و ستەم دەکشێتەوە!!(*)

(*) بە بۆنەی کشانەوەی سوپای داگیر کەرانی تاوانە سێ قۆڵییەکەی ساڵی ١٩٥٦ی بەریتانیا و فەرەنسا ئیسرائیل بۆ سەر میسر گوتراوە.

## لە ژێر پەیداخی ئازادی

کۆیە ١٩٥٩/٢/١٢

دەوەستین گشت قوتابی و خوێندەوار و کارگەر و جوتیار
لە ژێر بەیداخی ئازادی بەیەك دەنگ و بەیەك بڕیار

دەبینە شوورەیی پۆلا لە دەوری حوکمی کۆماری
دەبینە جانفیدای کوردی نەبەردی جەنگ و جەوهەردار

دەنووسین ناوی سەربەستی بە ڕووناکی گڕی شۆڕش
لەسەر لەوحەی خەباتی میللەتی تێکۆشەری هۆشیار

دەبا دوژمن بزانێ و دڵنیابێ هەر وەکو جەختە
نە دیگۆڵ و نە مەکمیلان، نە ئەیزنهاوەری بەدکار

زەفەرمان پێ دەبەن بۆ هەڵوەشانەوەی حوکمی کۆماری
ئەگەر سەد هەندە خەرجی کەن فرەنك و پاوەن و دۆلار

ئەبەد پیلانی پیلانگێڕەکان سەرناگرێ، هەردەم
هەموو میللەت دەجەنگێین یەك دڵو یەك ڕەنگو یەك ڕەفتار

دەبینە قۆچی قوربانی لە پێناوی وڵات و گەل
بەسەر بازو قوتابی و خوێندەوار و کارگەر و جووتیار

## سروودی نەورۆز

کۆیە: نەورۆز ١٩٥٦

بــە خێــر بێــی نــەورۆز، نــەو بــووکی بــەهار
دنیــا بـــەهۆی تـــۆ، پـــڕە لـــە گـــوڵزار
**

چەشـــنی بەهەشـــتە، دەشـــت و دەرو شـــار
چــەن جــوان و ســەوزن، میــرگ و میــڕ غــوزار
بنەوشـــەو لالـــە و بـــەیبوون و گوڵنـــار
وا بووژانـــەوەو کەوتنـــە لەنجـــەو لار
بـــۆ هـــەر لا دەچـــی وەرزیـــر و جووتیـــار،
گـــۆرانی دەڵـــێن، هـــەموو بەیـــەك جـــار

بــە خێــر بێــی نــەورۆز، نــەو بــووکی بــەهار
دنیــا بـــەهۆی تـــۆ، پـــڕە لـــە گـــوڵزار!!
**

کـــۆتر و کەناچـــەو بولبـــولی مـــەدهۆش
ئـــەمڕۆ دەخـــوێنن بـــە ســـۆز بـــە جـــۆش
بەرانبـــەر گـــوڵی پـــاراوو تـــەڕ پـــۆش
خۆشـــاوی پـــاکی شـــادی دەکـــەن نـــۆش
لــە جیــاتی شــەڕاب بــە شــەونم ســەرخۆش
ئـــەوانیش دەڵـــێن بـــە دەنگێکـــی خـــۆش

بەخێر بێی نەورۆز، نەوبووکی بەهار
دنیا بەهۆی تۆ پڕە لە گوڵزار!!

**

مرۆڤ لە خۆشی نەورۆزی ڕەنگین
شاد و سەرمەستە دەم بە پێکەنین
بۆ هەر لا دەڕۆی بەزمەو هەڵپەڕین
دڵ پاك بۆتەوە لە ڕق و لە قین
نەماوە هیچ کەس داماو و غەمگین
پێکەوە دەچڕن بەستەی شادی ژین

بە خێر بێی نەورۆز، نەو بووکی بەهار
دنیا بەهۆی تۆ پڕە لە گوڵزار!!

# گۆرانی

## کیژۆڵە دڵنەرمەکە

ئــــــەی کیژۆڵــــــە دڵنەرمەکـــــــە
ئـــــەی ناســــکە خـــــوێن گەرمەکـــــە

تـــــازە خونچــــــەی گـــــوڵی ژیـــــان
هیــــــــــوای دوارۆژی کوردســـــــــتان

هەچەنـــــد ژینـــــت خـــــوێن و خەمـــــە
ئاســـــۆی شـــــادیت تـــــارو تەمـــــە

دەبـــــێ بەرامبـــــەر کارەســـــات
ورە بـــــــەرزو خـــــــــــۆڕاگربی

بـــــۆ گیـــــانی ناپـــــاکی دوژمـــــن
هـــــاڵاوی گـــــڕی ئـــــاگر بـــــی

بـــــە بـــــاوەڕێکی زۆر بـــــەتین
دەبـــــێ ڕێگـــــەی خـــــەبات بگـــــری

لەبەر کۆسپی ڕێی تێکۆشان
فرمێسک هەڵنەڕێژی، نەگری

گریانت تاریکی شەوی
پڕ کارەستی ژیانە!

خەندەو قاقای پێکەنینت
ڕووناکی ڕێی تێکۆشانە!!

# کچی کورد

ئــــەی دلارامـــی گیـــانم، دڵ لــــەبۆت قوربانییـــە
چـاوی کاڵــت بــۆم شـیفایە، چـارەیی یەزدانییــە

رەوتــی سـیحراویت لــەلای مـن سـازترین ئاوازەیـە
دەنگ و دووی پڕ سۆزو نـازت خۆشترین گۆرانییـە!

بـەژن و بـاڵای نەونـەمامت شـلك و بـەرز و ناسکە
دەست پەنجەی نـەرم و نۆڵـت ڕاست نموونـەی جوانییـە

مـاچی دوو لێـوت لـەبۆ مـن، ئـاوی ژیـن و مانمـە،
بـــۆ ژیـــانی جاویـــدانی لێوەکانـــت کانییـــە!!

تـۆ نموونـەی شـای جـوانی، یـا فرشـتـەی یـا پـەری؟
هەر یەکێ بیگرێ لەمانە، قەت لە ئاست تۆدا نییە

تۆ کچی کوردی دلێری، مەردو ئـازاو شۆخ و شـەنگ
گەر بڵێن: جوانتر لەتۆ هـەن، من دەڵـێم: قـەت وانییـە!!

## سروودی نەتەوەی کاوە

کۆیە ١٩٥٦

ئـــەی نـەتـــەوەی کـــەی ئـەخـســـەر و کـــاوەی دلێـــر
تێکۆشـــــەران! جـــــەنگاوەرانـی نــــــەڕە شـــــێر
بـەسـەر بـەرزیی هـەموو میللـەت دەست لـە نـاو دەست
خـەبـات بکـەن، بـۆ یـەك ئـامـانج و یـەك مـەبـەست!

**

تێکـــــڕا هـەولْـــــدەن بــــۆ ڕمــــانی دوژمنــــان
بــــۆ هـــــەڵبڕینی بـەنــــدی جــــەرگی خـائینــــان
بـەسـەر بـەرزی هـەموو میللـەت دەست لـە نـاو دەست
خـەبـات بکـەن بـۆ یـەك ئـامـانج و یـەك مـەبـەست

**

هـــــــەموو بڵـــــێن: بڕووخــــــێ ئیمریــــــالیزم،
بمــــرێ دوژمـــن، بڕووخــــێ دەزگـــای فـاشـــیزم
بـەسـەر بـەرزی هـەموو میللـەت دەست لـە نـاو دەست
خـەبـات بکـەن بـۆ یـەك ئـامـانج و یـەك مـەبـەست!

## کەوی ئازادی

تشرینی یەکەمی ١٩٥٨

کـەوی ئـازادی بخوێنـە لەسـەر لووتکـەی چیـای بـارزان
بڵـێ: مزگێنی میللـەت، جەژنە، جەژنی کورد و کوردستان

سـەرۆکی قارەمانـت هاتـەوە بـۆ خـاکی پیـرۆزی
بـە شـانازی بکـەن پێشـوازی ئـەم سـەردارە ئـەی لاوان

دلێـر و پیشـڕەوی ئـازادیخوازانی گـەلی کـوردە
پڵنـگ و پاڵـەوانی کـوردە جەنـەڕاڵ مستەفای بـارزان

لـە پێنـاوی وڵاتـی بـوو بەرامبـەر دوژمنـی نگـریس
وەکـو شـێری نەبـەرد وەسـتا بـە هێـزی بـاوەڕ و ئیمـان

لـە ئـەنجاما بـەرەو سۆڤیەت خشـی بـۆ خـاکی ئـازادی
بە ناو چەرگی سوپای دوژمن لە بـەینی تورکیا و ئێران

گوڵی هیوای گەلی کوردی نەبەز سیس بوو بەڵام ئەمڕۆ
بە خوێنی شۆڕشی تەمووز، گەشە، پاراو شلك و جوان

بە سرووەی وەشتی دلشادی، بە مەی ئاونگی ئازادی
لە هەڵپەڕکێ و سەمادایە بەڕوو سوورە، بەدەم خەندان

دلێر و قارەمانی دوورخراوەی خۆشەویستی کورد
بەرە خاکی وڵاتی هاتەوە بۆ هەوڵ و تێکۆشان

لە بۆ تێکدانی پاشماوەی تەلاری حوکمی خونکاران
لە بۆ هەڵکەندنی ڕیشەی درەختی حوکمی زۆرداران

کەوی ئازادی بخوێنە لەسەر لووتکەی چیای بارزان،(*)
بڵێ مزگێنی میللەت جەژنە، جەژنی کورد و کوردستان

(*) بە بۆنەی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ وڵاتەکەی گوتراوە.

## شۆڕشی ١٤ی تەمووز

تـەممووزی ١٩٥٨ كۆیە

تـەوژمـی جـەور و ئـەشكـەنجەی بـەدو بـەدكار و زۆرداران
رق و قـاڕی گــەلی واخسـتـە كلّپــە هــەر وەكـو بوركـان!

لـە چـواردەی مـانگی تـەممووزدا، تـەقی هـاڕژن و شـاڵاوی
زراوی خـائینـــانـی بـــردو كەوتنـــە گێـــژەوی ڕوحـــدان!

بە زەبری هێزی بازووی گـەنجی سـەربازی سوپای سـەربەست
تــەلاری زولّــم و زۆر و تــاج و تــەختی شـایەتی ڕووخـان

ســەرۆك عـەبدولكــەریم یاسـا و نــەریتی بــەرزی كۆمـاری
لــە بـۆ میللــەت لــە ســەر بنچینــەیی پـۆڵایی دامــەزران

هــــەموو ئـــازادی خـــوازانی وڵات و دوورخراوانـــــی
ڕەهـاكردن لــە داوی كـۆتـی بەنـدیی و نـەفی تێهەڵـدان!!

# گوڵە باخ

کۆیە ١٩٥٦

ئەی چرای گەشی چیمەن،
فرشتەی سووری گوڵشەن
ڕەونەقی ژینی ڕەوشەن
تۆ نەو بەرەی بەهاری
تۆ شاگوڵی گوڵزاری!

**

چەند نەشئەدار و گەشی؟
چەندە ساغ و بێ خەشی؟
ناز و عیشوە دەبەخشی!
وەك نەخشی ناو نیگاری
دەست چێنی دەستی یاری!!

**

چەند جوان و شۆخ و شەنگی
چەند نازدار و قەشەنگی
گوشادکەری دڵتەنگی!!
تۆ نیشانەی سەربەستی
بزوێنی بیرو هەستی!

بولبولی مەست و مەدهۆش
بەرامبەر خونچەی تەڕپۆش
دەخوێنێ بە سۆز و جۆش
ئاوی شەونم دەنۆشێ
گەڵای سەوزی دەپۆشێ!

**

لە ناو گوڵشەن سەر بەرزی،
چەند ناسك و شلك و تەرزی؟
جوانترین گوڵی سەر ئەرزی!
تۆ ڕەمزی شادمانی!
تۆ مایەی کامەرانی!!

## گۆرانی

# یارەکەی شۆخ و شەنگم

کۆیە ١٩٥٥

یارەکـــەی شـــۆخ و شـــەنگم گیانەکـــەم فـــاتم،
هــەر تــۆی مایــەو هــۆی شــادی گشــت ســات و کــاتم
هەرچەنـــدە مـــن لێـــت دوروبـــم، بـــە دڵ لـــەلاتم
بەنـــد و ئەســـیری تۆمـــە، زوو بـــدە نـــەجاتم
یارەکـــەی شـــۆخ و شـــەنگم، گیانەکـــەم فـــاتم!

**

قـــەد و بـــەژن و باڵاکـــەت هـــیچ هاوتـــای نییـــە
شـــکل و بـــەرز و جـــوان و ڕێـــك وەك شـــەنگە بییـــە
بەڕاســـتی وێنـــەو شـــیوەت و چەشـــنی پەرییـــە
یارەکـــەی شـــۆخ و شـــەنگم گیانەکـــەم فـــاتم!!

**

گـــــەردنی ســـــپی و لووســـــت مایـــــەی ژیانـــــە
هـــــۆی ئیلهـــــامی وێـــــژەوان، هـــــەم شـــــاعیرانە
مایـــــەی کوشـــــتن و فـــــەوتانی گشـــــت عاشـــــقانە
یارەکـــــەی شـــــۆخ و شـــــەنگم گیانەکـــــەم فـــــاتم

**

ئـــــەو جووتـــــە ســـــێوەی ســـــینەت دڵمـــــی کێشـــــاوە
لـــــە ســـــیحری خـــــاڵی گۆنـــــەت ســـــەرم ســـــوڕماوە
بـــــە تیـــــری غـــــەمزەی چـــــاوت جـــــەرگم بـــــڕاوە،
یارەکـــــەی شـــــۆخ و شـــــەنگم گیانەکـــــەم فـــــاتم!

# گوڵی نێرگز

کۆیە ١٩٥٥

لــــەگوڕەی کـــژی خۆشــــی بـــەهارا،
ســـەر دێنێتـــە دەر لـــە میـــر غـــوازارا،
گوشـــــــادو ڕووخـــــــــۆش
ناســــك و تــــــەر پــــۆش
دوور لـــــە ئـــازار و ئەزیـــەتی دەوران
لەگـــەڵ هـــاو تـــوخی دەژی کامـــەران
**
گـــوڵێکی جوانـــە لـــەم چـــۆڵ و دەشـــتە،
زەمـین لـە سـایەی چەشـنی بەهەشـتە
رازەو و رەنگـــــــــــــــین
خـــــــەملیو و نەخشـــــــین
ســــەرتاپا ســــپی و زەردە نێرگســــجاڕ
بــە وێنــەی قــاڵی پــڕ نــەخش و نیگــار!
**

لــه دیـدەی ئـاسـمـان دێتــه خـوار ئـەسـرین
دەكـەوێتـــــه ســـــەر فنجـــانـی زێـــڕین
چەشـــــــــنی مـــــــــرواری
كـــــــــاتێ دەبـــــــــاری
پڕشـــــــنگی زێــــڕی ڕۆژی لـــــێ دەدا،
دەدرەوشـــێتـەوە چەشــنی شـــەو چـــرا !!

# گۆرانی

# کیژی ئەم دێیە

کۆیە ١٩٥٨

(ئەڵێن جوانە وەکو حوورە گەردن سپییە
بەژن ڕێك و بێ قسوورو هیچ عەیبی نییە)[١]

**

شۆخ و شەنگە وەك قوڵنگە ناسك و نازدارە
شل و ملە، چاو بەکلە بەلەنجەو لارە

چەن جوانە خانو مانە چەشنی گڵووکە
مایەی ژینە ڕوو نەخشینە هەر وەکو بووکە

ئەبرۆ ڕەشە ڕوومەت گەشە ئەگریجە خاوە
خوێن شیرینە دڵ پڕ تینە ئاواتی لاوە

(١) کاتی خۆی هونەرمەندی ناسراوی گەلە کمان مامۆستا باکووری ئەم دێڕە شیعرەی بۆ شارەزای باوکم ناردووەو داوای لێکردووە کە بۆی تەواو بکات ئەویش بەم سێ دێڕە شیعرەی تر بۆی تەواو دەکات یەکسەر مامۆستا باکووری ئاوازی بۆ دادەنێ و لە ئێزگەی کوردی بەغداد تۆماری دەکات. (ئەم زانیارییەم لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە مامۆستا باکووری دەسکەوت. کامەران کەریم شارەزا)

# پەشیمانی

هەموو دەم من دڵ و گیانم لەلاتە
ژیانی خۆم لە بۆ عەشقت خەڵاتە

کە تۆم دۆڕاند گەلێ سادەو نەزان بووم
بە بێ ئەزموونی ڕۆژگاری ژیان بووم

شەوانی ژووانی دڵداریم لە بیر چوو
وەکو خەونێ لە پر هات و بەسەر چوو

نەفامانە دڵم گۆڕی بە بی هۆ
کەچی ئەمڕۆ پەریشانم بە بێ تۆ

شەو و ڕۆژ پیشەمەگریان و ناڵە
گوشاری ساتێ بۆم خەون و خەیاڵە

لـــه داخـــی دووری تـــۆ خوێنـــاوه جـــه‌رگم
لـــه ماتـــه‌م دام پـــه‌ڵاس و جـــاوه بـــه‌رگم

بـــووره! مـــن په‌شـــیمانم هـــه‌زار جـــار
لـــه ئـــه‌م كـــاره‌ی كـــه كـــردم وه‌ك ڕیـــا كـــار

لـــه بـــۆم ده‌ركـــه‌وت یه‌كـــه‌م دڵـــداری ڕاســـته
بـــه ده‌ر لـــه‌و پێچه‌وانـــه‌ی هه‌ست و خواســـته!

# لە یاسای ئیمپریالیزم

بەغدا: هاوینی ١٩٦٣

لای ئینسانی باوەڕ نزم
لە یاسای ئیمپریالیزم!

تێکۆشەری ئازادی خوا
دوژمنێکە، دوژمنی خوا

دیل و ژێر دەستی زۆر دارە
پشتی کێڵگەی قەمچی و دارە!

سەری نیشانەی شەستیرە
بۆ پەتی ئیعدام نێچیرە

بەڵام ئەوانەی زۆر دارن
یا نۆکەری ئیستیعمارن،

پایەدار و کار بەدەستن
بە سامانی میللەت مەستن!!

## هیوای دوا ڕۆژ

شەترە ١٩٦٣

برای هەژاری ڕەنجەڕۆ
هەرچەند ئەمڕۆ
دەستەی هێزی ڕەشی مردن
بۆ تێکدان و وێرانکردن
دەستی لەسەر
جڵەوی کاروفرمانە
حوکمڕانە!
بەڵام هەردەم دڵنیابەو
چاك بزانە
بەم زووانە
هێزی خەبات و سەرکەوتن
یەك دەگرن
وەکو بورکان
بەرپا دەکەن
گڕی شۆڕشی بێ ئەمان
دنیا دێتە جۆش و هەژان
دەستووتێنن

تەخت و بەختی

تاوانکارانی فاشستی

زۆر بەڕاستی بنیات دەنێن

تەلاری قایم و سەختی

حوکمی یەکسانی و سەربەستی

# بەشی
# شیعری فێرکردن

١ ئۆپەرێتی وەرزەکانی ساڵ

٢ شانۆگەریی ڕێگەی بەختیاریی

٣ دەمە تەقێی ڕێگەی زانین

# ئۆپەرێتی وەرزەکانی ساڵ

هەولێر ١٩٧٢/١١/٨

بەهار:

وەرزی بەهارم وەرزی بەهارم
وەرزی ژیان و گوڵ و گوڵزارم

خاوەن نەورۆز و مانگی گوڵانم
وەرزی ئاهەنگ و بەزم و سەیرانم

دەمی خۆش بەختی دۆست و یارانم
کژی کوڵشەن و لالە زارانم!!

کوا خۆشیی هاوین دەگا بە خۆشیم
پەستیی چۆن دەگا بە شادی نۆشیم؟

کوانێ پاییز و گەڵارێزانی،
دەگەن بە نەورۆز لە خۆشی و جوانی؟

یاخود زستان و سەهۆڵبەندانی
دەبنە نیسانی پڕ شادمانی؟

ئاشکرا و ڕوونە لای دۆست و دوژمن
شایانی منە تاجی سەرکەوتن!!

هاوین:

وەرزی هـــــــــاوینم، وەرزی هـــــــــاوینم
مــــن وەرزی خۆشـــیی میـــوه و هـــەنگوینم

وەرزی هـــــاوینم دۆســــــتی هــــــەژاران
دوژمنــــــــی دەرد و شـــــیفای بیمــــــاران

دەمــــــی ئازووقــــەو خـــــۆراکی هـــــەرزان
بــــــەهاو بــــــرەوی ســــــەهەند و زۆزان!

ســــــەردەمی گێـــرەی خەلــــەو خـــــەرمانم
کــــــاتی بەرهــــــەمی بــــــاخ و بێســـــتانم

پــــــاکم! خۆشـــــترین ســــــەردەمی ســــــاڵم
ســــــروەی بەهەشــــــتە شـــــنەی شــــــەماڵم

بەهار:

ڕەشـــابات گەرمــــە هـــۆی ئــێش و ئـــازار
هــــەوای مــــن خۆشــــە، ســــارد و ســــازگار

ســــــەرەتای ژیـــــــنم ڕۆژی نــــــــەورۆزە
هــــــەموو ســــــاتێکم خـــــۆش و پیــــرۆزە!!

پایز:

وەرزی پایزم، وەرزی پایزم
دڵم فێنکە لە گەرما زیزم

کاتی مشتاخی میوەی ڕەنگینم
تافی خۆش بەختی و گوشادی ژینم

دەمی کێڵان و سەردەمی شۆمە
وەرزی جوتیاریی و چاندنی تۆومە

سەرەتای وەرزی هەورو و بارانم
مزگێنی هێنی خۆشیی ژیانم

بەهار:

نەخێر تۆ وەرزی شوومی خەزانی
وەرزی نەخۆشی و گەڵارێزانی

زستان:

وەرزی زستانم، وەرزی زستانم
سەردەمی هەور و بەفر و بارانم

وەرزی چلوورەو سەهۆڵبەندانم
بۆیە وا سەختە ڕێی تێکۆشانم

گرتوومــــه ڕێگـــەی ســـەختی نەبـــەردی
گـــەلێك ســـەر بـــەرزم، دەژیــم بــە مــەردی

کەســـــێ نــــەچێژێ تـــــاڵیی ژیـــــانی
نــــاچێژێ خۆشـــــیی ڕێــــی کامــــەرانی

هەرچەنـــد ژیـــانم بـــە بـــەفر و بایـــە
بـــەڵام (ناخۆشـــیی خۆشـــی لـــە دوایـــە)!

بەهار:

تـــۆ وەرزی ســـەرما و ئـــێش و ئـــازاری
دوژمنـــــە گـــــەورەی چینـــــی هـــــەژاری

کــــژی چڵپـــــاو و بــــــەرفر و بـــــارانی
دۆســــــتی دوژمـــــــن و دژی یـــــــارانی!

زستان:

بــــا خـــــۆر بکەینــــە ناوبژیکـــــەرمان،
بیکـــەین بـــە گـــەورەو ڕێ نیشـــاندەرمان

تـــــاکو بـــــزانین کاممـــــان جـــــوامێرە؟
کاممـــان ســـوود بـــەخش و ڕەنـــدو دلێـــرە؟

بەهار:

کاممان ڕازاوە و کاممان ڕەنگینە؟
کاممان دڵگیر و کاممان شیرینە؟

هاوین:

خۆرمان دادوەربێ خۆرمان دادوەربێ
خۆرمان پێشەوا و ڕێ نیشاندەر بێ

پایز:

ئەی خۆری ڕووناك بگە هانامان
ببە دادپرس و فەرمانڕەوامان!!

هەرچی تۆ بڵێی، سەر چاو و سەرمان
بە گوێ کردنت فەرزە لە سەرمان

خۆر:

من خۆرم کانگەی ڕووناکی و تینم
بۆ ئێوە هەردەم سەرچاوەی ژینم

هەر چوارتان ڕۆڵەی دڵسۆزی منن
تانەو تاریکی چاوی دوژمنن

من بۆیە ئێوەم هێناوەتە دی
تاکو هەر یەکە بەخۆشی بژی

هــــەر کـــەس بـــۆم بڵـــێ کـــردەوە و کـــاری
ڕەوشـــــــتی بــــــەرز و خزمــــــەتگوزاریی

هــــــەتا بــــــزانم کــــــرداری چـــــاکی
هیـــــواو ئامـــــانج و مەبەســـــتی پـــــاکی

بەهار:

ئـــــەمن بــــــەهاری نێرگـــــز و گــــــوڵم
بــــــەهاری کـــــۆتر و قـــــومری و بولبـــــولم

وەرزی ســــــەیران و کــــــاتی گوشــــــادیم
کـــاتی خـــۆش بـــەختی و جـــەژنی ئـــازادیم

هاوین:

هـــــــاوینم کــــــژی میـــــوەی شــــــیرینم،
هــــــاوینی خێــــــر و بێــــــر و جــــــۆخینم!

پایز:

پــــــایزم دۆســــــتی چینـــــــی جوتیــــــارم
جــــووت و چاندنـــــە کــــــردەوە و کــــــارم

زستان:

چەنــــد جوانـــە ڕەنگـــی دیمـــەنی جـــوانم؟
دیمــــــەنی لووتکــــــەی بــــــەرزی کێـــــوانم!

بــــــەفر و ســــــەهۆڵی یــــــاڵ و نــــــزارم
دەتەقێنــــــــــــەوەکانی و ڕووبــــــــــــارم

خۆر:

لــــــــه دەوری منـــــــدا بســــــــوورێنەوە
بــــــڕۆن، بەخۆشــــــی و شـــــادی بێنـــــەوە

وەرزەکان:

خــــۆری پڕشـــــنگدار دایکـــــی میهرەبــــان
کانگــــەی ڕوونــــاکی و ســــەرچاوەی ژیــــان

بمــــان ســــــوڕێنەوە لەخولگــــــەی خۆتــــا
لــــه نــــاو گەردوونــــدا وێڵــــین بــــه دووتــــا

بمــــان ســــــوورێنەوە بـــــەرەو ڕۆژهـــــەڵات
بــــــەرەو ســــــەرچاوەی ئامــــــانج و ئــــــاوات

ڕوو لــــه کــــوێ بکــــەین ئــــەو جــــێ یــــه خۆشــــه
بــــــێ تــــــۆ دنیامــــــان تاریکـــــه بۆشــــــه!

هــــەر چوارمــــان وەرزی تــــەنیا ســــاڵێکین
بــــــێ جیـــــاوازیی ڕۆڵــــــەی مـــــاڵێکین

هــــەمووما‌ن پــــەردەی شــــانۆی ژینێکـــــین
دیمــــەنی جــــوانی ســــەر زەمینێکـــــین!!

# شانۆگەری ڕێگەی بەختیاری

هەولێر: ١٩٧٨/٢/١٥

**دیمەنی گشتی**

کێڵگەیەکی گەورەی دامێنی شارێکی کوردستانە کارگەیەکی چنینی لە نێوانی شار و کێڵگەکە دروست کراوە و قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە نزیکیانەوەیە بۆ فێرکردنی قوتابیان و لە ناوبردنی نەخویندەواری کراوەتەوە

## پەردەی یەکەم

**شوێن:** کێڵگەکەیە

**بارام:** جووتیارێکی نەخوێنەدەواری هەژارەو خەریکە بە جووت و گا کێڵگەکە دەکێڵێ.

**ئایش:** ژنی بارامە و خۆی و دوو منداڵی یاریدەی بارام دەدەن.

**ئازاد:** بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیە.

**شلێر:** مامۆستایە و ئێواران نەخوێندەواری لە ناو ئافرەتان لە نێو دەبات.

**فاتم، شەم، خونچە، مەنیج:** چوار ئافرەتی نەخوێندەوارن

بارام: (لە بەرخۆیەوە) دەڵێ:

من جووتیارم، بە ئارەقەی نێو چەوانم

دابین دەکەم

ژیانی خاوو خێزانم

ئازاد: (دەگاتە ئاستی بارام و دەڵی):

ماندوو نەبی خاڵۆی جووتیار

خاڵۆی زەحمەتکێشی هەژار!

بارام: یا خوا ڕۆڵە بەر خورداربی

دوور بی لە بەڵای نابەکار

ئازاد: چۆنی لەگەڵ

جووت و گاو و کارو بەرهەم

بارام: کارم زۆرە و بەرهەمم کەم

ژینم هەمووی

چەوسانەوەو ماندوو بوونە

ئەمە حاڵمە لەوەتی هەم!!

کەچی هەندێ کەس ژیانی

باش گۆڕاوە

بەختەوەرە، خوا پێداوە

چاك دەسووڕێ گوزەرانی!!

ئازاد: ئەوانەی کە خوا پێداون
یا زۆردارن!!
یا زیرەك و خوێندەوارن
لە ئیش و کاری دنیادا
ئاگادارن!!
کاروباری کشتوکاڵیان
بە ئامێر و تراکتۆرە
ماندوو بوونیان گەلێك کەمە
داهات و بەرهەمیان زۆرە!!
تۆش لەبەر نەخوێندەواری
هەر دواکەوتووی
گیرۆدەی داوی هەژاریی

بارام: خۆزگە منیش
وەك ئەو خودا پێداوانە
خوێندەوار بام
لە کارو باری دنیادا
ئاگادار بام
بەڵکوو لەم قۆرتی ژیانە
لەم تەنگانە
ڕزگار دەبووم
بەرەو ڕێگەی شادی دەچووم

ئازاد: باش بوو ڕاستی تێگەیشتی
نەزانینە مایەی گشتی
ئەم بێ هۆشی و ئەم نووستنەت
ئەم هەژاری و دواکەوتنەت
لە نێو ئەم کۆمەڵی کوردە
فەرمانی لە ناوبردنی
نەخوێندەواری جاڕ درا
بڕیار درا
چ پیاو چ ژن
دەبێ فێری خوێندن بین!

ئایش: (ژنی بارامی جووتیارە و دوو منداڵی پێیە)
گەر هەموومان
ڕووبکەینە قوتابخانە
ئەی کاسبی و فەرمانمان؟
ئەدی ژیان و گوزەرانمان؟

ئازاد: بە ڕۆژ کارو
سەر لە ئێوارانیش خوێندن
خامەتان بکەن بە چقڵی
چاوی دوژمن؟!

بارام: مامۆستا کەی دەست پێ بکەین
به خوێندن و زانست فێربوون؟!
تا تێبگەین
ئێمەش بۆ خۆمان پێبگەین!

ئازاد: ئەمڕۆ.. سبەی
دەست پێ دەکەین
به خوێندن و زانست فێربوون
تاکو به ئاواتمان بگەین!!
(ئازاد، بارام، ئایش و منداڵەکانی لەبەر چاو ون دەبن)
شلێر (لە ڕێی ئاو کێشان تووشی فاتم و شەم و خونچە و مەنیج
دەبێ کە هەریەکەیان جەڕەیەکی لەسەر شانە)
ماندوو نەبن خوشکانی زین
خوشکەکانی
خەج و ستی و شەم و شیرین!
مژدەبێ ڕێگەی ژیانتان
بۆ خۆش کرا
بڕیار درا
نەخوێندەوار، چ پیاو، چ ژن
دەبێ فێرە خوێندن ببن!!

فاتم: قوتابخانە هەر بۆ لاوە
ئێمە فێربوون و خوێندمان
بۆ ئەوان خستۆتە لاوە!!

شلێر نەخێر! بیر و بۆ چوونت هەڵەیە
ژن نیوەی ئەم کۆمەڵەیە!
تا فێرە خوێندن نەبێ ژن
بڕوات نەبێ بە پێشکەوتن

شەم: گەر بۆ قۆڵ ڕووتی بێ خوێندن
نامانەوێ
نە زانست و نە پێشکەوتن!
شلێر: بۆ قۆڵ ڕووتی نییە خوێندن
هیوای گشتە
خوێندن سەرچاوەی ڕەوشتە
ڕووناکی ڕێگەی ژیانە
پێشکەوتن ئاواتی بەرزی
هەموومانە!!

خونچە: گەر بچینە قوتابخانە
ئەی ئەم کۆرپە ساوایانە؟
کێ منداڵمان بۆ بەخێوکا
لانکمان بۆ ڕابژێنێ

کێ نان بکا؟ کێ ئاو بێنێ؟!
کێ مەشکەمان بۆ بژێنێ؟!

شێر: قوتابخانە
تەنیا سەر لە ئێوارانە
دوای کاروبارو فرمانە
ڕێ لە فرمانتان ناگرێ
لە پێش کاری کابانیتان
نابتە کۆسپ بابتە گرێ!

مەنیج: مامۆستا گیان
ئامۆژگاری و وتەکانت
زۆر بە نرخن
گەلێ جوانن
هەموویان ڕاست و دروستن
ڕێگە خۆشکەری ژیانن
بە وتەی زۆر شیرین و خۆش
تێت گەیاندین سوودی خوێندن
سوودی زانین و پێشکەوتن
ئێساکەش کەی
دەست پێبکەین

بە خوێندن و زانست فێربوون
تا لە کارو باری دنیا
باش تێبگەین

شلێر: ئەمڕۆ، سبەی بەم زووانە
دەست بە کاری خوێندن دەکەین
تا بگۆڕێ ڕێگەی چەوتی
ئەم ژیانە
پڕ لە ئەرك و تێکۆشانە!!

**(پەردە دادەدرێتەوە)**

## پەردەی دووەم

**شوێن:** ناو کارگەیە.
**کات:** کاتی حەسانەوەی کارێکارانە.
**کەسەکان:** بەڕێوەبەری کارگە، خەریکی نووسینە.
**پیرۆت:** کرێکارێکی نەخوێندەواری پەرپووتی هەژارە.
**زارا:** کرێکارێکی ئافرەتی خوێندەوارە.
**کاوە:** کرێکارێکی خوێندەوار و پسپۆڕی ئامێرە.
**عەولا:** کرێکارێکی نەخوێندەواری کەم تەرخەمە.
**سۆران:** کرێکارێکی خوێندەوارە و دڵسۆزی کارو فرمانەکەی خۆیەتی.
**نەوزاد:** نوێنەری سەندیکای کرێکارانە.

پیرۆت: (لەبەر خۆیەوە دەڵێ)
چەند ساڵە من کرێکارم
هەروا پەڕپووت و هەژارم
کاری خەڵکی وا لە پێشە
ژینی منیش ئازار و ئەشکەنجەو ئێشە!
(ئنجا دێە بەردەم بەڕێوەبەرو دەڵێ:)
ئاغام میرم! گەورەی ژیرم
ژیری بەڕاو و تەگبیرم

بەڕێوەبەر: (لەگەڵ نووسین خەریکە و بێ دەنگ دەبێ
پیرۆت: میرم کەمێك سەر هەڵبڕە!
ڕێگەم بدە لە دوای سەلام
پێشکێشت بکەم سکاڵام

بەڕێوەبەر: فەرموو بێژە، من براتم
نەمیرم و نە ئاغاتم!
خزمەتگوزاری ئێوەمە
ڕۆڵەی دڵسۆزی وڵاتم!

پیرۆت: دەڵێن: دەوری یەکسانییە
سەردەمی کامەرانییە!
ژینی مرۆڤ لە گۆڕانە

کەچی ژینی منی هەژار
هەر وەکو جاری جارانە!!

عەولا: (سەر لە بنا گوێی چەند کرێکارێك دەنێ و بە لە پێی دەستیشی
جووڵەی لێوی لە بەڕێوەبەر دەشارێتەوە)
خوا زەمانە لە سەرەتاوە
بەردی گەورەو
بەردی بچووکی داناوە!
کێ دەڵێ ئەمڕۆ سەردەمی
یەکسانییە؟
ڕۆژی هەوڵ و تێکۆشان و
ژیانی کامەرانییە؟!

بەڕێوەبەر: (ڕوو لە پیرۆت و کرێکارەکان دەکات و دەڵێ:)
ئێوە باری گوزەرانتان
باش گۆڕاوە
کەی وەکو جاری جارانن
ئەمڕۆ هەموو کارتان هەیە
ڕۆڵەی ژیان و فرمانن
لێژنەی سەندیکاتان هەیە
دەوڵەت مافتان دەپارێزێ
لەبەردەم یاسا یەکسانن!!

سۆران: (لە نزیك عەولا وەستاوە، ڕوو دەکاتە کرێکارەکانی دەورو
پشتی و پێیان دەڵێ:)
مرۆڤ با خۆی لە هەق نەکا
ژیانی ئەمڕۆ و ژیانی ئەوسا
باش گۆڕاوە
جیاوازیی ئەم دوو ژیانە
وەك ئاسمان و ڕێسمانە!

پیرۆت: من پیاوم و زارا ژنە
کەچی مووچەی
سێ ئەوەندی مووچەی منە
کاوەش وەکو من کارگەرە
بۆچی من بەڕپووت و برسیم
ئەویش تێرو بەختەوەرە؟!

بەڕێوەبەر: بەڵێ ڕاستە لەم جیهانە
نەك هەر ژیان
هەموو شتێ لە گۆڕانە
زاراو کاوە
نەزان و نەخوێندەوار بوون
ڕوویان کردە قوتابخانە

خوێندەواری و زانین فێربوون
بۆیە كاریان پاك و پوختە
لە هەموو كارێكی كارگەدا
شارەزانە
بەرهەمیان تا بڵێی جوانە!!

عەلا: (سەر لە بنا گوێی چەند كرێكارێك دەنێ و پێیان دەڵێ: )
قوتابخانە! خوێندەواری
كاری باش و بەرهەمی جوان
ئەمانە (هەر قسەی ڕووتن
ناچنە گیرفان!)
هەموو درۆن
دەكەونە بەر گوێ و زوو دەڕۆن!!

كاوە: كارگەرێكی چوست و
چالاك و دلێرم
وەستای پسپۆڕی ئامێرم
دڵسۆزی كارو فرمانم
ڕۆڵەی خەبات و ژیانم

عەولا: (بە كرێكارەكانی دەورو پشتی دەڵێ)
دڵسۆزیی چی؟ فرمانی چی؟!

تێکۆشان و ژیانی چی؟
پیاو ئەوەیە (بەڕی خۆی لە ئاو دەربێنێ)
بۆ کار هیچ خۆی نەشێوێنێ!
ڕۆژ بەڕی کا
بێ ماندوو بوون نان پەیاکا!
سەر بۆ یاسا دانەنوێنێ!!

زارا: ئافرەتێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیرم
لە کارو فرمانی کارگە
شارەزا و هۆشیارو ژیرم
شان بە شانی براکانم
بە کرداری باش و بەرهەم
خزمەت دەکەم
ڕۆڵەکانی نیشتمانم!!

سۆران: (پشتگیریی وتەکانی زارا دەکات و دەڵێ:)
بەڵێ ڕاستن
وتەکانت گەلێ تەواو و دروستن
(شێر کە لە بێشە هاتە دەر
چ نێر و چ مێ)
هەر جی بە جێ
ئازایەتی خۆی دەنوێنێ

کاری پێویستی سەر شانی
دێنیتە جێ
زارا ئەمڕۆ خوێندەوار و
ڕۆشنبیرە
بۆیە وا هۆشیار و ژیرە!!
بەڕێوەبەر: (ڕوو دەکاتە پیرۆت و پێی دەڵێ)
کەچی تۆ نەخوێندەواری
بۆیە دووری
لە خێر و خۆشی زانیاریی!!
کارت نارێك
بەرهەمت کەم
مووچەشت لە قەدەر بەرهەم
کەمە بۆیە تۆ هەژاری
گرفتاری
ژینی سەخت و ناهەمەواری
کرێی کەم و زۆر خێزانی
تۆیان خستۆتە ئەندێشەی
نیگەرانی!!

پیرۆت: گەلێك سوپاس
من زۆر چاك لە خۆم گەیشتم
نەخوێندەوارییە ئەمڕۆ
شکاندوویە شان و پشتم!
ئەم دەردەی نەخوێندەواریم

بۆتە سەرچاوەی هەژاریم

سۆران: (بە کرێکارەکانی دەورو پشتی دەڵێ:)
زۆر ڕاست دەکەی
هەژاری و نەخوێندەواری
دوو دەردی کوشندەی گەلن
مایەی دوا کەوتنی کۆمەڵن!!
بەڕێوەبەر: ئافەرین باش تێگەیشتی
نەخوێندەوارییە ئەمڕۆ
مایەی گشتی
ئەو هەموو بەڵاو دەردانەی
باڵیان کێشاوە بەسەرمان
بوونەتە مایەی هەژاری و
دەردی سەرمان!
پیرۆت: لەم تەمەنەم
دەبێ چۆن ببێ ڕزگاریم
لەم دەردەی نەخوێندەواریم؟
نوینەری سەندیکا: (بە ژوور دەکەوێ و دەڵێ:)
مژدە مژدە
مزگێنی لەم گەلی کوردە
لە هەموو لایێ جاڕ درا
بڕیار درا
ئەوانەی نەخوێندەوارن
چ پیاو چ ژن

دەبێ فێرە خوێندن ببن
(پیرۆت و کرێکارە نەخوێندەوارەکان):
کەی بچین بۆ قوتابخانە
تا بگۆڕین
باری چەوتی ئەم ژیانە؟!
نوێنەری سەندیکا:
ئەمڕۆ سبەی بەم زووانە
دەست دەکرێ بە نەهێشتنی
نەفامی و نەخوێندەواری
ڕزگار دەبین لە نەزانی و
دواکەوتن و دەردەداری!!
کرێکارە نەخوێندەوارەکان:
پەیمان بێ هەموومان بچین
بۆ خویندنگا
بۆ فێربوونی خوێندەواری و
زانستەکان بگرین ڕێگا
نەهێڵین نەخوێندەواری
خۆش کەین ڕێگەی
پیشکەوتن و بەختیاری

**پەردە دادەدرێتەوە**

## پەردەی سێیەم

**شـوێن:** حـەوشـی قوتـابـاخـەنـەیـە، ئـاهـەنگی تـەواوبوونی خوینـدنـی کرێکار و جوتیار و ئافرەتە نەخوێندەوارەکان دەگێڕدرێ.

**کات:** سەر لە ئێوارەی ڕۆژێکی سەرەتایی هاوینە.

کەسەکان: لە مامۆستایان: ئازاد، شلێر،

لە کارگەران: عولا، پیرۆت.

لە جووتیاران: بارام.

لە ژنەکان: فاتم، شەم.

ئازاد: نەمان هێشت نەخویندەواری
ڕزگارتان بوو لە دواکەوتن
لە ژینی پەست و بێزاری
ئەمڕۆ دەژین
بەسەر بڵندنی و هۆشیاری!
شلێر: خویندوار بە دەستەڵاتە
ڕۆڵەی بەکاری وڵاتە
نەوەی خۆشەویستی گەلە
هیوی دوا ڕۆژی کۆمەڵە!
ئازاد: لە بەند و کۆتی نەفامی
ئەمڕۆ سەربەست و ڕزگارە
لە کاروباری دنیادا

زۆر شارەزا و ئاگادارە!

عەولا: پایەداربن مامۆستایان

ئێوەن بۆ ئیمە ڕابەری

ڕێگەی ژیان

ڕزگارتان کردین لە کۆتی

نەفامی و نەخوێندەواری

پیشانتان داین ڕێگەی ڕاستی

سەرفیرازی و بەختیاری

بارامی جوتیار:

من جووتیارم

ڕۆڵەی ڕەنج و ئیش و کارم

دوینی نەفام و نەزان بووم

ئەمڕۆ خویندەوار و ژیرم

وریا و بەڕاو و تەگبیرم

ئامێری جووت و هەوجارم

تراکتۆرە

بۆیە بەرهەمی کێڵگە کەم

پوخت و زۆرە!!

شلێر:

هەر تیشك و وزەی زانینە

مایەی گۆڕانی ئەم ژینە!

فاتم:

من تاكو نەخوێندەوار بووم

بێ سەواد و کۆڵەوار بووم!

کەچی لە سایەی مامۆستا

ئێستاکە من خوێندەوارم

لە بەند و داوی نەفامی

ئەمڕۆ سەربەست و ڕزگارم

پیرۆت: کارگەرێکی خویندەوارم

لە گشت کارێکی کارگەدا

من شارەزا و ئاگادارم

بارام: نەمام ناشتن، تۆ و چاندنم

بە ڕێگەی ڕاستی زانینە

بۆیە بەرو بوومم زۆرە

کێڵگەکەم هەردەم، سەوز و شینە

بەرهەمم جوان و ڕەنگینە

عەولا: خوێندەوارم

بۆیە هۆشیار و بەکارم

هەموو ئیشم بە نەخشەیە

لەسەر بنچینەی زانستە

بۆیە بەرهەمی کارگەکەم

جوان و نایاب و دروستە!

بارام: من درویێنەم بە ئامێرە
بۆ کوتانی گەنم و جۆکەم
پێم ناوێ جەنجەڕ و گێرە
ئەم دەسکەوتەش
بەری کۆشش و خوێندنە
خوێندن پەیژەی سەرکەوتنە
شەم: ئافرەتێکی خوێندەوارم
کابانێکی دەست ڕەنگینی
زۆر پاك و پوخت و پەیارم
ڕووناکبیرم
بۆیە من هۆشیار و ژیرم
مامۆستا ئازاد: پیاو و ئافرەتی خوێندەوار
دوو کۆڵەکەی
بە هێزی جەستەی کۆمەڵن
تان و پۆی پتەوی گەلن
تا پێش نەکەون پیاو و ژن
ناگەینە لووتکەی سەرکەوتن
کۆرس (بریتی یە لە ئازاد و شلێر، عەولا و پیرۆت، بارام و فاتم و شەم)
زانین تیشکی ڕووناکییە
سەرچاوەی خۆشی و پاکییە

پەیژەی سەرکەوتنی گەلە،
مایەی سەر بەرزیی کۆمەڵە

ئاسۆی ڕووناکی هیوایە
پڕشنگی بیرو بڕوایە

هێزی کردار و بەرهەمە،
هۆی شادی و لابەری خەمە

با بگرین ریێی بەختیاری
ڕێگەی فێربوون و هوشیاریی

بگرین ڕێی زانین و خوێندن
دەگەینە، لووتکەی سەرکەوتن

**پەردە دادەرێتەوە**

کـــــــۆتـــــــایـــــــی

**٣**

## دەمە تەقێی ڕێگەی زانین

باوك: کوڕی شیرینی بە نرخم،
جگەر گۆشەم ڕۆڵە بەرخم
زووکە بڕۆ بەرەو خوێندن
بۆ فێربوون و بۆ سەرکەوتن
کور: بەڵێ گەورەم، بابە گیانە
گرتوومە ڕێی قوتابخانە
باوك: وانەکانت باش تێبگە
بۆ ئەم میللەتە پێبگە
کوڕ: هەر خەریکی تێکۆشانم
باش تێدەگەم وانەکانم
باوك: گوێ ڕایەڵی مامۆستابە
زیرەکێکی بێ هاوتابە
کوڕ: باوکە دوێنێش مامۆستامان
بە وانە و ئامۆژگاریی جوان

سوودی زانستی فێرکردین
ئەم وتەی پێ لەبەر کردین

ئەوەی بگرێ ڕێگەی زانین
هەر دەگاتە ئامانجی ژین

## کۆچی دوایی دلاوەر(*)

هەولێر ١٩٧٠/١٢/١٥

پڕشـــنگی ئاســـۆی ئاســـمانی کـــوردان
ئەســـتێرە گەشـــەی هیـــوای کوردســـتان

زانـــــای توانـــــای دانـــــای بلیمــــەت
مـــەلای بـــەڕێزو بـــەرز و بـــە قیمـــەت

تێکۆشـــــەرێکی بـــــە بیـــــرو بـــــڕوا
ئاشـــتیخوازێکی ڕاســـت و بـــێ هاوتـــا

پێشـــکەوتنخواز و ئـــازادی پـــەروەر
لـــــە تەنگانـــــەدا ئـــــازا و دلاوەر!

ســـاڵی هـــەزار و نـــۆ ســـەد و حـــەفتا
کەوتـــە ڕێ بـــەرەو بارەگـــای خـــودا

بـــۆ بەهەشـــت فـــڕی ڕەوانـــی پـــاکی
بۆمـــان مایـــەوە کـــردەوەی چـــاکی!!

(*) نازنـاوی شـاعیریی مـەلا محەمـەدی مـەلا برایمـی عـەوالانی ئیمـامی مزگـەوتی حـەتك بـوو لـە شـاری کۆیـە، لـە ڕۆژی ١٩٧٠/١٢/١٣دا لـە نەخۆشخانەی کەرکووك لە ئەجامی دەردێکی کوشندە کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی برایەوە کۆیەو نێژرا

**به بۆنەی کۆچی دوایی وەزیرو پێشمەرگەی کورد**

## کاک نافیز جەلال حەوێزی

کۆیە ١٩٧٢

وەزیری خزمەتگوزار و
پێشمەرگەی کورد
ئەوەی گیانی
بۆ ئاشتی و بۆ سەرفیرازی
میلەتەکەی خۆی بەخت کرد!
شەهیدی ڕێگەی خەباتە
نابێ بڵێین ڕۆیشت و مرد!!
چونکە نامرێ
ئەوەی مەرد و قارەمان و بێ
ئەوەی لە ناو دڵ وگیانی
هەزاران بێ
نامرێ ئەوەی خۆشەویستی
لێ قەوماو و هەژاران بێ
نامرێ ئەوەی ئاشتیخواز و

دوژمنی شەڕ پەرستان بێ
نامرێ ئەوەی
شەهیدی ڕێگەی ئازادیی
کوردستان بێ
تا هەتایە هەر زیندووەو
جاویدانە
خوێنی گەشی بۆ گەلی کورد
شەفەقی ئاسۆی ژیانە!!
مەشخەڵی بەرز و ڕووناکی
ڕێگەی تاری تێکۆشانە
گیانی پاکی
ڕەوشت و کردەوەی چاکی
بیرو باوەڕی ڕووناکی
دەڕوێن لە ناو خوێن و هەست و
سۆز بیرمان
لە ناو مێشك و
لە ناو دڵی گەنج و پیرمان

نەمرە و نامرێ
پیشمەرگەی خۆ بە ختکەرمان
دەبا بمرێ دێوی مردن
لە ترسنۆکی و لە شەرمان
ئەمڕۆ هەموو ئازا و مەردێ
هەموو کوردێ
لە ناو دڵ و تۆی جگەری
بە دڵسۆزیی هەڵدەکەنێ
نەخشەی پیرۆزی پەیکەری!!

## بۆ کۆچی دوایی

## (**ئەگرین**)ی کوڕی کاک ئەحمەدی دارەتوو[1]

هەولێر - شوباتی ١٩٧٧

گـــەر بـــە گریـــان بـــێ هاتنـــەوەی (ئـــەگرین)
هـــــەتاکو مـــــابین ئیمـــــە بـــــۆی ئـــــەگرین

بـــەڵام ئـــەو ڕاســـتییەی کـــەوا دەیـــزانین
لـــــــەم دنیایـــــــەدا هـــــــەموو میـــــــوانین

ئـــــــەوەی میـــــــوان بـــــــێ ڕۆژێ دێ دەڕوا
پاشـــای خوونکـــار بـــێ یـــا نـــەخۆ گـــەدا!

لـــە بـــەردەم مـــردن هـــەموو مـــل کـــەچین
ڕزگـارمـــــان نـــــابێ بۆکـــــوێ دەربچـــــین

ئـــەوەی کـــە پیـــرە یـــا نـــەخۆ گەنجـــە
بـــە کوشـــتن بچـــێ یـــا بـــە شـــیرپەنجە

مـــردن هـــەر یەکـــەو نـــەمان بـــۆ لەشـــە
نـــامرێ ئـــەو کەســـەی کـــردەوەی گەشـــە!!

ڕەوشـــتی پـــاك و کـــردەوەی ((ئـــەگرین))
بردیـــان بـــۆ بەهەشـــت پێـــی نـــاوێ بگـــرین

---

(١) کاکە ئەگرینی جوانەمەرگ لە ١٩٥٦/٧/١ لەدایك بووەو لە ١٩٧٧/١/١٧ کۆچی دوایی کردووە.

## بۆ سەر كێلی مەزاری ئازیزان

بۆ كێلـی گۆڕی سووداد چاوشلـی
كە بە بۆمبای فڕۆكەی ئێران خـاوو
خێزانـەكەی لـەناو چوون

لــــە پــڕ بـــێ ئاگـــا، بـــە بۆمبـــای دوژمـــن
بــــووین بـــە خــــۆراكی، ئـــــەژدەهای مـــردن

بــە زینــدووەتی چـاو زینــدە بــە چـاڵ بــووین
بـــێ ســـووچ و خـــەتا وێرانـــە مـــاڵ بـــووین

یـــاخوا ئــــەو كەســـەی كـــە شـــەڕی دەوێ
لــــــە مــــــن خراپتـــــر كۆســـــتی بكـــــەوێ،

خـــۆی و منـــــداڵی و ژنــــــی بـــــە جـــــارێ
بۆمبـــا و غـــەزەبـــی خوایـــان لـــێ بـــارێ!!

## بۆ کێلی گۆڕی (دانا)

(دانـــا) لاویـــك بـــوو تـــا حـــەز بکـــەی مـــەرد
خـــۆ بەختکـــەر بـــوو لـــە کـــۆڕی نەبـــەرد
شـــوورەی پـــۆڵا بـــوو بەرامبـــەر دوژمـــن
نـــەژیا بـــۆ مـــردن، لـــە ڕێـــی میللـــەت مـــرد!!

## بۆ کێلی گۆڕی سەلامی مەلا محەمەدی مەلا عەلی باداوەیی مزگەوتی منارە

کۆیە ١٩٦٧/٧/٥

ســـەلام بـــۆ گـــەلی کـــورد تێـــت دەکۆشـــی
لـــــە دنیـــا نەتـــدی ســـاتێکی خۆشـــی،

بـــەڵام ئەمڕۆکـــە لـــە نـــاو بەهەشـــتا،
لەگـــەل شـــەهیدان، شـــادیی دەنۆشـــی!!

## بۆ کێلی گۆڕی بەهزادی[*]خوشکەزام

کۆیە ١٩٦٨

ئێــــوە قـــەت مــــەڵێن بــــەهزاد مـــــردووە
تـــــەنیا بـــــە دیمــــەن لێمـــــان ون بــــووە

چۆتــــــە ســــــەردانی مــــــام و بـــــاپیری
چونکــــــە دڵپاکــــــە و حەڵاڵــــــە شــــــیری

لــە چـواردەی مـارتـی ساڵی شەست و هەشـت
پەپوولـــــەی گیـــانی فـــڕی بـــۆ بەهەشـــت!

---

[*]بەهزاد کوڕی (حەکیمە)ی خوشکم بوو لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا بە نەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کرد.

## بۆ کۆچی دوایی ئازاد سەدرەدینی بەرزنجی

١٩٩٠/١٢/٢٦

دەبـــێ خۆشـــی چیـــت تـــۆ بـــە دنیـــا بـــێ
ئەگـــەر تـــاڵاوی مـــەرگی لـــە دوا بـــێ
چەنـــد ســـاڵێك بـــژی یـــا نـــەخۆ ســـەد ســـاڵ
رۆژێـــك دێ رۆژی ژینـــت ئـــاوا بـــێ!

بـــەڵام ئەوانـــەی کـــە جـــەنگاوەرن
لـــە رێ وڵات و گـــەل تێکۆشـــەرن
مردنیـــان ژینـــە و هـــەردەم لـــە یـــادن
چونکـــە دلێـــر و خـــۆ بەختکـــەرن!!

بۆیـــە قـــەد مـــەڵێن: ئـــازاد مـــردووە
تـــەنیا لـــەلاتان کـــۆچی کـــردووە
چونکـــە شـــەهیدی خـــاکی وڵاتـــە
لـــەناو دڵمانـــدا، هـــەردەم زینـــدووە!

# کارەساتێکی گەورە

**بۆ کێڵەکانی سەر گۆڕی (شێروان تەلعەت) و (مژدە)ی هاوسەری و (کاوە)و (لاوە)ی کورانیان و کۆرپەلەیەکی ناو زگی دایکی و چوار خزمیان دانراوە کە لە دوای نیوە ڕۆی ٣١ی ئاداری ١٩٩١ (ڕۆژی کۆڕەوەکە ك.ك. شارەزا) بە بۆمبای فڕۆکەیەکی جەنگی بەعس لە گەڕەکی (سێتاقان)ی هەولێر شەهید کران.**

هەولێر ١٩٩١/٧/٨

(١)

## شێروان

(شێروان)ی لاو و (مژدە)ی هاوسەری
ژیان سەردەمێ بە بەختەوەری

دوو ئەستێرە بوون لە ئاسمانی ژین
لە ناکاو کشان، شادی بوو بە شین

(کاوە) و (لاوە) یان توند گرتە باوەش
چوون بەرەو بەهەشت بە دڵێکی گەش

هەموو بێ تاوان، سەر بەرز و شادن
لە بەردەم یەزدان، گەردن ئازادن

کوشتەی فڕۆکەو بۆمبای گڵاون
گوناهیان نییە و زۆر لێ کراون

شەهیدی گەلن، شەهیدی وڵات
چوونە ناو بەهەشت، گەیین بە ئاوات

(٢)

## مـــــــژده

(مــــژده) ژنيـــك بـــوو، لــــه رۆژی دەعـــوا
بەرامبـــەر دوژمـــن بـــوو بـــه شـــێری خـــوا،

ســـنگی قـــەڵغانی گوللــــه و بۆمبـــا بـــوو
مــــەرگ و کـــوژرانی لــــەلا وەك بـــا بـــوو

کـــاتێ شـــەهید بـــوو، دڵنيـــا و شـــاد بـــوو
لــــه بارەگـــای خـــوا، گـــەردن ئـــازاد بـــوو

خـــۆی و کۆرپەلــــەی جـــەرگ و هـــەناوی
پێکــــەوه مــــردن، هــــەر لــــه پێنـــاوی

ميللـــــەتی کـــورد و خـــاکی کوردســـتان
تـــا سەربەســت بــژين لەســەر ڕووی جيهـــان

(٣)

## کــــاوه

کـــاوەی ئێســـك ســـووك نۆبـــەرەی شـــێروان
زوو کەوتـــــه ڕيـــزی قافڵــــەی شـــەهيدان

ئەوەنـــده نـــەژيا تـــێ بگـــا لـــه ژيـــن
بـــووه بـــه فرشـــتەی بەهەشـــتی بـــەرين

(٤)

## لاوه

(لاوه)ی بچکۆڵـــەی هـــیچ خۆشـــی نـــەدیو
زۆر زوو کـــۆچی کـــرد بـــۆ دنیـــای ئـــەو دیـــو

چـــــووە باوەشـــــی دایکـــــی شـــــیرینی
کەوتـــــە بەهەشـــــت و خۆشـــــی مژینـــــی

بێچـــــوە شـــــەهیدی میللـــــەتی کـــــوردە
مایـــــەی شـــــانازیی درشـــــت و وردە!

(٥)

## لـــەیـــلا

لـــەیلا شـــۆخێك بـــوو لـــە بـــاخی دنیـــا
ئـــەمڕۆ حـــۆری یـــە لـــە بەهەشـــتی خـــوا

چونکـــــە شـــــەهیدە، شـــــەهیدی وەتـــــەن
پێـــی نـــاوێ گریـــەو شـــینی بـــۆ بکـــەن

(٦)

## دیمەن

(دیمـــــەن) قوربـــــانی خـــــاکی وڵات بـــــوو
پایـــــەی شـــــەهیدی بۆیـــــە خـــــەڵات بـــــوو

دوێنـــی گوڵێـــك بـــوو لـــەم کێـــو و دەشـــتە
ئـــــەمڕۆ بولبـــــولی بـــــاخی بەهەشـــــتە!!

(٧)

## چیمـــەن

جــاران دەیــان گــوت: (کــوڕ بــەرخی نێــرە)
کـــەچی ئەمڕۆکـــە، کچـــی کـــورد شـــێرە!!

کچـــی وەك (چیمـــەن) ســـنگی ئەمڕۆکـــە
بۆتــــە قـــــەڵغانی بۆمبـــــای فڕۆکـــــە!

هـــەر ئامادەیـــە، بـــە دڵ و بـــە گیـــان
شـــەهید بـــێ لـــە ڕێـــی، خـــاکی کوردســـتان!

(٨)

## ڕەهێڵ

ئـــــەمڕۆ ڕەهێڵـــــی فرمێســـــك دەڕێـــــژین
لاشـــــەی خوینـــــاوی (ڕەهێـــــل) دەنێـــــژین

بــــەڵام پێـــــی نـــــاوێ بـــــۆی بکـــــەین ڕۆ ڕۆ
کـــۆتری نـــاو بـــاغی بەهەشـــتە ئـــەمڕۆ!!

## بۆ کێلی گۆڕی جەلال حەوێز حەوێزی

١٩٧٥/٥/٣٠

ماموٚســـــتای وەکــــو جـــــەلال حـــــەوێزی
تــــا دنیــــا مــــابێ، دەمێنـــــێ ڕێــــزی

پیـــــاوی زانســــت و، پیــــاوی کـــــردەوە،
لــــه هـــــەردوو دنیـــا گـــۆی خـــۆی بـــردەوە

ســـاڵی حـــەفتاو پێــنج ســی مـــانگی ئایـــار
لەســــەر ئـــــارەزووی خـــوای پــــەروەردگا

بـــــۆ بەهەشـــــت فـــــڕی ڕەوانــــــی پـــــاکی
بۆمـــــان مایـــــەوە ڕەوشـــــتی چـــــاکی!

## بۆ کێلی شەهید محەمەد سەرسپی کە لە زیندانی بەعس شەهیدکرا

١٩٩١/٧/٢٨

ئــەی چــاو بگریــە، فرمێسـکی ئاڵــت، بــە خــوڕ بڕێــژە
لاشـــەی خـــوێنینی ئـــەم قارەمانـــە خێــرا بنێـــژە

نــەوەکو دوژمــن کەللــەی بــە نرخــی زوو بکـا بــە گــۆ
لـه مـەیدانـی جـەنگ، بیداتـه بـەرشـەق بە بێ شـەرم و شۆ

زامــی دەروونمــان ببێتــە ناسـۆری پـڕ لــە سـفت و سـۆ
پێتــر ببــرژێ، زیــاتر هــەڵقرچێ جـــەرگی مــن و تـــۆ

## بۆ کێلی گۆڕی شەهید (زانا)ی مەحموود هەمزە

١٩٩١/٧/٢٧

(زانا) مەردیك بوو، ئازا و جەنگاوەر، لە تافی جوانی
بۆ میللەتی کورد، خاکی کوردستان، بوو بە قوربانی

فیداکارانە، بە خوین نەخشاندنی، تابلۆی ژیانی
تا ئێمە بژین، بەسەر بڵندی و، بە کامەرانی!!

## بۆ لاوانەی فاروقی کوڕی حەوێزی حاجی ئەحمەدی کۆیی
## کە لە دووره وڵات کۆچی دوایی کرد

بیری فاروق بۆ زانین داگیرسا بوو
قوتابیەکی دوکتۆرای فەرەنسا بوو

ئاشقێکی زانین بوو هەتاکو مرد
ناو بانگێکی گەورە و چاکی بۆ خۆی برد

ئاشقێك بوو، ڕۆڵەی شارەکەی کۆیە
لێمان ڕۆیی بۆیە دڵمان بەسۆیە

گۆڕستانی شاری هەولێری دێرین
میوانێکی ئازیزت بۆ دەنێرین

ڕێزی بگرە هەر ئەمڕۆ لێت میوانە
سبەی جێگەی بەهەشتی دڵدارانە!

## بۆ کێڵی گۆڕی (قادر)ی نەوەی (ئەبو بەکر)
## کە بە دەستی باوکی لە ١٩٩١/٨/١٦ دا کوژرا

١٩٩١/١٠/٢٨

دایە من ڕۆییم، بۆم مەکەن شیوەن
بە خۆشی دنیا قەت باوەڕ مەکەن**!!**

شادیی ژیانمان هەر خەم و ژانە،
ئەنجامی ژینمان مەرگ و نەمانە**!**

بە دڵنیایی دەرچووم لە دنیا
گەردن ئازادم لە بارەگای خوا

داخێکم بۆ تە گرێی کفنەکەم،
تا ڕۆژی حەشر لە یادی ناکەم**!!**

ئەو باوکەی دوێنێ کە پەیدای کردم
ئەمڕۆ بە ناهەق لە ناوی بردم**!**

**بۆ کێلی گۆڕی شەهید (هاوڕێ)ی**

**کوڕی محەمەد عەلی دزەیی**

١٩٩١/٣/٣١

لاوان مـــن ڕۆیـــیم، هیـــوای کـــورد ئێـــوەن
مـــن بەهەشـــتیمە بـــۆم مەکـــەن شـــیوەن

چونکـــــە شـــــەهیدم خوێنینـــــە بـــــەرگم،
شەســـتیری دوژمـــن داویـــە لـــە جـــەرگم

بـــووم بـــە قوربـــانی، ئـــەم گـــەلی کـــوردە
ڕێگـــای شـــەهادەت، ڕێـــی ئـــازا و مـــەردە

مـــن دۆســـت و هـــاوڕێی هـــەموو مـــەردێکم
مـــــن فیـــــداکاری گشـــــت نەبـــــەردێکم!!

## بۆ کێلی گۆڕی کەمالی سەید تاهیری کاکەیی

## کە لە ساڵی ۱۹۹۲ دا بە ناهەق کوژراوە

١٩٩٢/٦/٥

گیـــانی بــێ خـــەتای کـــەمالی لاو چـــاك
بـــە گوللـــەی چـــەکی دوژمنـــی نـــا پـــاك

وەك گـــوڵ هـــەڵوەری لـــە باغچـــەی ژیـــان
چـــــووە باوەشـــــی خـــــاکی کوردســـــتان!

ئومێـــــدەوارین (کـــــاروان)ی کـــــوڕی
جـــەرگی دوژمنـــــی بـــــاوکی هەڵـــــدڕی!

## بۆ کێلی گۆڕی (دارا)

(دارا) کوڕێك بوو، تابڵێی ئازا و ژیر و وریا بوو
پێشمەرگەی کورد و خۆ بەختکەری هەردەو چیابوو

پەپوولەی گیانی لە ماچ کردنی گوڵیکێوو دەشت
کە تێر بوو فڕی، بۆ ناو گوڵزاری ڕازاوەی بەهەشت

تا بەکامی دڵ، بۆ خۆی هەڵمژێ هەڵاڵەی گوڵان
لەو جێیە پاکە بژی ژینێکی خۆش و جاویدان!

## بۆ مەرگی خوناو(*)

١٩٩٥/٥/٢٦

ئــــەمڕۆ بــــاغی کــــورد ســــیس و ژاکــــاوە
بــــێ گەشــــو گــــوڵی و بــــە بــــێ خونــــاوە

بولبــــول بەرامبــــەر گــــوڵی هــــەڵوەریو
دڵــــی زامــــدارە و جــــەرگی خوێنــــاوە!

ئەســــتێرەی هیــــوای خۆشــــی دوا ڕۆژمــــان
لــــە پــــڕ ئــــاوا بــــوو، کەوتــــە پــــەناوە!!

چــــرای ئــــاواتی ژینــــی شــــادیمان،
لەگەرمــــەی گەشــــیی لێمــــان کــــوژاوە

هــــەرچی دەیگــــری لــــە دۆســــت و یــــاران
پەســــت و خــــەمناك و لێــــو هــــەڵقرچاوە

(*) خوناو: کچە ئەندازیاری کورد، کچی مامۆستا خالید مەعجووم بە هەڵە بە گوللەی براکەی کوژرا

هـــەر دایــك و باوكـــە جـــەرگیان ســـووتاوە
هـــــەر بـــــراو خوشـــــكە پشـــــتیان شـــــكاوە

كارەســــــــاتێكە و كۆســــــــتی گەورەیــــــــە
كـــــۆچی ئـــــازیزە و مـــــەرگی خونـــــاوە!!

بۆیـــــە دیاریمـــــان بـــــۆ گیـــــانی پـــــاكی
هـــــەر ئـــــاخ و داخ و فرمێســـــكی چـــــاوە!

## بۆ كێلی (ڕابەر)ی مستەفا ڕابەر

١٩٩١

(ڕابـــــەر) پێشـــــڕەوی كـــــاروانی ژيـــــن بـــــوو
ئـــــەمرۆ بـــــە ناهـــــەق وا گـــــۆڕ نشـــــين بـــــوو

خونچـــــە گوڵێـــــك بـــــوو لـــــە باخچـــــەی ژيـــــان
دوژمـــــن گـــــوڵ غونچـــــەی گيـــــانی هـــــەڵوەران

بـــــوو بـــــە قوربـــــانی خـــــاكی پيـــــرۆزی
مايـــــەی شـــــانازيی نەتـــــەوە و هـــــۆزی!!

# چوارینەکانی شارەزا

## ژینی دنیا

١٩٩١/٧/٣٠

تــۆ خۆشــیی چیــت بــێ بــە ژینــی دنیــا
گـــەر ســـاتێك لـــە خـــۆت نـــەبێ دڵنیـــا
لـــە پـــڕ بـــێ ئاگـــا گیانـــت دەربچـــێ
ببیـــە لاشـــەیەك لـــە گـــۆڕی تـــەنیا !!

## ژیـــانم

١٩٩١/٧/٣١

ژیـــــانم دنیـــــای پـــــڕ کارەســـــاتە
تـەلیســـمی ڕێگـــەی هـــات و نـەهاتـــە
هـــەموو ســـاتێکی تـەمـــەنی کـــورتم
خـــەم و خـەفـەتـــە و خۆشـــییم لـــێ قاتـــە!

## دنیای ژیانمان

١٩٩١/٨/١

دنیای ژیانمان کارواسەرایە،
پڕ هات و بات و هەراو هوریایە
دەستەیەك دێت و دەستەیەك دەڕوا
هەمووی دووچاری دەرد و بەڵایە!

## ژیان و مردن

زۆر کەس لە کاروباری (ژیان) دا
هۆشیار و ژیرن، زۆر شارەزا نە

کەچی کام زانای بیگری لە دنیا،
بەرامبەر (مردن) گێژ و نەزانە!!

## سروودی ئاڵای میللەت

هەولێر ١٩٧٢/٢/٩

میللـــەت کـــە هاتـــە مەیـــدانی ژیـــان
بەرزەکاتـــــەوە ئـــــاڵای تێکۆشـــــان

ئـــاڵای ئـــازادیی و بـــەرزیی وڵاتـــی
دروشـــمی ڕێگـــەی هـــەوڵ و خـــەباتی

ئـــەی ئـــاڵای میللـــەت هـــۆی شـــانازیمان
نیشـــانەی شـــادی و ســـەرفیرازیمان

ڕێ نیشـــاندەری ڕێگـــەی ڕاســـتیمان
ســـایەو ســـێبەری ڕۆژی ئاشـــتیمان

هێـــزی شـــۆڕش و فیـــداکاریمان
تیشـــکی ڕووناـــکی ڕێـــی ڕزگاریمـــان

پـــەیمان بـــێ پـــەیمان تـــا ڕۆژی مـــردن
هـــەرگیز نەوەســـتین لـــە کۆشـــش کـــردن

لـــەکاتی جـــەنگ و شۆڕشـــی میللـــەت
ســـاتی خـــەباتی خـــوێنین و هەڵمـــەت

لـــە بـــەردەم دوژمـــن ببـــین بـــە پـــۆڵا
مـــردین کفنمـــان بکـــەن بـــە ئـــاڵا !!

## سروودی نەوەجەوانان

هەولێر ١٩٧٢

ئێمـــــــە تیپـــــــی نەوجـــــەوانین
بێچـــــوە شـــــێری نیشـــــتمانین
مـــــەردو ئـــــازا و پاڵـــــەوانین،
پشـــــتیوانی بـــــێ کەســـــانین

**

ئێمـــــە ڕۆڵـــــەی ریـــــی خـــــەباتین
نـــــەو نـــــەمامانی وڵاتـــــین
ئێمـــــە بـــــۆ چینـــــی هـــــەژاران
تیشـــــکی ڕوونـــــاکی نـــــەجاتین

**

ئێمـــــە ڕۆڵـــــەی قارەمـــــانین
پاســـــەوانی کوردســـــتانین
بـــــۆ گیـــــانی دوژمنانمـــــان،
تانـــــك و تـــــۆپی بـــــێ ئـــــەمانین!!

# سروودی ئێمە کوردین

هەولێر ١٩٨٠/٣/٣

ئێمە کوردین بێچووە شێرین،
نەتەوەی کاوەی دلێرین

نەوەی تازەی کوردستانین
پێشڕەوی ڕێی تێکۆشانین

گەنجینەو سامانی گەلین
هیوای دوا ڕۆژی کۆمەڵین

شوورای قایمی وڵاتین،
جەنگاوەری ڕێی خەباتین

پاسەوانی باخی ژینین
بۆ سەرکەوتن هێز و تینین

بە زانست و خوێندەواری
دەردێنین ڕیشەی هەژاریی

بۆ دنیای شادی دەروازەین
بنیاتنەری ژینی تازەین!!

ڕۆڵەی کاوە و کەی خوسرەوین
نەوەی تازەین و پێشڕەوین

## سروودی ڕاپەڕین[*]

هەولێر ١٩٩٣/٣/١١

ئـــەمڕۆ ڕۆژی ڕاپەڕینـــە، ســـەردەمی ئازادییـــە،
ڕۆژی مــەرد و قارەمانــە، کــەر نــەڤالّی شــادییە!!

ئەمڕۆ پێشمەرگە بە جارێ، بەرگی شادی کردە بەر،
دوژمنی فاشی لە خاکی پاکی خۆی دەرکردە دەر!!

بۆیە کوردستانی ڕەنگین هەر وەکو باخی بەهەشت
جوان و خەملّیوە بە جارێ کێو و باخ و دۆڵ و دەشت

سەد شوکر هۆشیارە پێشمەرگەی دلێر و قارەمان
نایەڵێ چی دیکە دوژمن، پێ بنێتە نیشتمان

هەر بژی بەیداخی بەرزیی خاکی پاکی کوردستان
هەر بژی کوردی دلێر و حوکمی یاسا و پەرلەمان

---

(*) لە یادی دوو ساڵەی ڕاپەڕینی کوردستان گوتراوە.

## هاتنەوە

هەولێر ١٩٨٣/٨/٢٠

شـــەوی بـــووکێنی و مـــانگی هــــەنگوین،
چەنــد درەنــگ هــاتن، چەنــدە زوو ڕۆیــین؟
نیازمـــان وابـــوو لــــە دنیـــای شـــادی
خۆشـــترین ســـاتمان، پێکــــەوە بــــژین!

پــە پوولــەی بــێ وەی گــوڵزاری دەشــت بــین
فرشـــتەی پـــاکی بـــاخی بەهەشـــت بـــین
کـــەچی چـــەپۆکی گـــەردوونی چەبگـــەرد،
تـــۆی لـــێ ڕفانـــدم لــــە یــــەکی کـــردین

مــن لـــە بەنــدی غــەم، تــۆ لـــە ئەســیریی
دەبـــێ بچێـــژین پەســـت و دڵگیریــــی
لەبـــەر دووریــــی تـــۆ خـــۆراکم غەمـــە
لـــەلام نـــەماوە هۆشـــیاریی و ژیریــــی

لە دیار کۆرپەکەت دڵ پڕ گرینم
شەو تا بەیانی لە زارو شینم،
بە ڕۆژ و بە شەو هەر چاوەڕوانم
گەر بە خەویش بێ جارێك بتبینم!!

هەتا پێت بڵێم: ڕۆڵە جوانەکەت
جگەر گۆشەکەی نەرم و نیانەکەت
زمانی پژاو بە دایەو بابە،
کۆرپەی بە نازی دڵ و گیانەکەم!

چەند جار ڕۆژی ڕوون چاوی هەڵدێنێ
سوپای تاریکی شەو دەبەزێنێ
هەر چاوەڕوانم تاکو ئەو ساتە،
مژدەی هاتنەوەی تۆم بۆ بهێنێ!

## بۆ کیژۆڵە گریاوەکە

هەولێر ١٩٨٢/٩/٢٧

ئـــــەی کیژۆڵـــــە دڵنەرمەکـــــە
ئـــەی نـــازدارە خـــوین گەرمەکـــە

تـــازە غونچـــەی گـــوڵی ژیـــان
هیـــــــــــوای گەشـــــــــــی
دوا ڕۆژی ڕوونـــــــی کوردســـــــتان

هـــــــەر چەنـــــــد ژینـــــــت
دەریایـــــەکی خـــــوین و خەمـــــە
ئاســـــــــــۆی شـــــــــــادیت
ڕەش دا گـــــــەڕاوی ماتەمـــــــە
نـــابێ قـــەت ورە بـــــەر بـــــدەی
خـــــەم و تـــــاڵی هـــــەموو دنیـــــا
لەســــەر دڵـــــی خـــــۆت باربکـــــەی

دەبێ بەرامبەر کارەسات
خۆ ڕاگربی
بۆ گیانی نا پاکی دوژمن
بڵیسە و گڕێ ئاگر بی
بە باوەڕێکی زۆر بەتین
دەبێ ڕێگەی خەبات بگری
لە بەر کۆسپی ڕێی تێکۆشان
ڕۆندك نەڕێژی قەت نەگری

گریان نیشانەی بەزینە
دەروازەی نائومێدی یە
مایەی خەم و پەستیی ژینە!!

بە گریان و فرمێسك ڕشتن
زنجیر و بەندی ژیانت
ئەستوور تر، گرانتر دەبێ
زام و ناسۆری دەروونت
بە ژانتر، وێرانتر دەبێ!!

ئەی کیژۆڵە گریاوەکە
دڵ ناسکە داماوەکە
بەسیە گریان
هەستە ڕابە
بگرە ڕێی ڕاستی تێکۆشان
یاخی ببە
لەم ژیانە و لەم جیهانەت
تێکۆشان و یاخی بوونت
بەرەو ئامانجی گەل چوونت
ڕێگەی ڕاستیی سەرکەوتنە
مایەی خۆشی و پێشکەوتنە
گریانت تاریکە شەوی
پڕ کارەسای ژیانە
خەندەو قاقای پێکەنینت
ڕووناکی ئاسۆگەی گەشی
ڕێی خەبات و تێکۆشانە!!

# گۆرانی بەنازی

هەولێر ١٩٧٦/١/١٧

بەنازی کچێ بە نازی
تۆ چاو شەهێن و بازی
چەند جوان و شۆخ و شەنگی
چەند دڵگیر و دڵخوازی؟!

**

تۆ کام شۆخی کام زەری؟
یا کام وێنە و پەیکەری؟
ڤینۆسی خوای جوانی؟
تۆ ئینسانی یا پەری؟

**

گەردن بە خاڵی کەو نی
هەرچ بڵێم تۆ ئەو نی
پەری جوانی ئەڤینی؟
یانە خەیاڵ و خەو نی؟!

**

خەونی خۆشی لاوێنیم
خۆشەویستی و خاوێنیم،
هیواو ئاواتی دڵم،
گوڵی گەشی زاوێنیم!!

# چەوتیی ڕۆژگار

هەولێر ١٩٨٤/٦/٢٥

کــا شــیعر؟ کــوا ســۆزی پــڕ هێــز و وزە؟
کــــوا ئــــەدەب؟ ڕۆژی درۆی حیــــز و دزە!

کــوانێ ڕاســتی؟ هەربــەناوە ئــەم وشــە!
مامڵــــەتی بــــازاڕی هــــەق سســــت و کــــزە

ئاشــی بــێ هــۆش و نــەزان کەوتۆتــە گــەڕ
بــاش دەهــاڕێ دانــی شــادی بــێ مــزە

ســـەردەمێکی پــڕ لــە ئــازار و خــەمــە،
کــوا لــەســـەر لێــو مــاوە تارمــایی بــزە؟

کــێ دەڵــێ شــادی لــەســەر ئــەم خاکــەما
دڵ ســوتا، جــەرگیش ئــەوا کەوتــە کــزە

بۆیــە ناچــارم شــەڕابی خــەم دەخــۆم،
دڵ دەبــرژێ وەك کــەباب بۆتــە مــەزە!!

## خزمەتگوزار و بەدکردار

هەولێر ١٩٩١/٧/٣١

هەزار ساڵ بژیت لەم دنیای دوونە
ئەنجامی ژینت مەرگە، تێچوونە!

بێ ئاگا دەبێ، بێ ئاگاش دەمرێ
بێ دەستەڵاتی لەم چەند و چوونە

ڕەوشتی پاکت، کردەوەی چاکت
باشترین سەرمایەن لەم هاتوچوونە

خزمەتگوزاری میللەت و وڵات
ڕۆژگاری ژینی گوشاد و ڕوونە

بەڵام بەدکردار لە ناو کۆمەڵدا
بەشی ڕیسوایی و شەرمەزار بوونە

جیاوازیی نێوان هەردووکیان وەکو
جیاوازیی نێوان بوون و نەبوونە!!

## بۆ کوڕە نۆبەرەی بازرانی کوڕم

١٩٨٨/٢/٣

### لێزان

خۆشەویستمان لێزانە
خۆراکی دڵ و گیانە!

جگەر گۆشەی بارزانە
نۆبەری پەری خانە

پرچی زەردی زێڕینە
چاوی پیرۆزەی شینە،

ڕەنگی سپی بە تامە
بالاّی تازە نەمامە

ماچی کولّمی شیرینە
دەڵێی ڕاوی هەنگوینە

هەتا بڵێی جوانە
خۆشەویستی هەموانە

سبەی ڕۆڵەی نەبەردە
هیوای دوا ڕۆژی کوردە!

## قوتابی ژیر

بۆ پێزانی کوڕی سۆران
پایزی ٢٠٠٨

ڕۆڵـــــــەی شـــــاری هـــــــەولێرم
ژیـــــــر و وریـــــــاو دلێـــــــرم

قوتـــــــابی پـــــۆلی چـــــــوارم
ئـــــازاو چوســــــت و هوشـــــیارم

وانــــــەی خـــــۆم لەبـــــەر دەکــــــەم
کۆششــــــــی لەســــــــەر دەکــــــەم

زانینمــــــــان ڕونــــــــاکی یــــــــە
نـــــــــەزانین تاریکییـــــــــــــــە

مامۆســــــــــــتا ڕابەرمانـــــــــــە
گیــــــان و چـــــــاو و ســــــــەرمانە

هـــــــــەمووومان خۆشــــــــــمان دەوێ
بــــــە ئـــــــاواتین ســــــــەرکەوێ

## لەدایک بوونی ڕازان[1]

هەولێر ٢٠٠٨/٧/٧

پـــار ڕازان ڕۆیـــی ئـــەمڕۆ هاتـــەوە
ئێـــەی خســـتە نـــاو خۆشـــی و هاتـــەوە

خـــەم چەنـــدە زۆربـــێ شـــادی لـەدوایـــە
گەیشـــتنە ئامـــانج گەشـــترین هیوایـــە

هیـــــــوای دوا ڕۆژی وڵات و هـــــــۆزە
دوای ســەختی ســەرما جــەژنی نــەورۆزە

نـــەورزی بـــاو ك دایـــك و خزمانـــە
ڕۆژی گوشـــادی (جـــوان) و (ســـۆران)ە

لێمـــان نەســـتینێ ئـــەم کۆرپـــە جوانـــە
دیـــاریی خودایـــە بـــۆ خێرییـــە خانـــە

نـــەوەی شـــارەزای ڕێگـــەی ژیانـــە
ڕونـــــاکی چـــــاوی فریشـــــتەخانە

---

(١) ڕازان کچێکی نەشمیلانەی (سۆران)ی کوڕم بوو لە تەمەنی سێ ساڵیدا گوڵی ژیانی هەڵوەری دوای ساڵێکی تر کچێکی تریان بوو هەمان ناویان لێنایەوە.

خۆشەویســــتەکەی پـــووره پەخشــــانه
دڵــــی ئـــالان و جـــەرگی ئایشـــانه

خـــــــــــــاڵۆزای تـــــــــــــــەلار
ئـــــــــــــامۆزای هێلــــــــــــــین

خۆشەویســــتەکەی ســــۆلین ولاڤـــین
پـــووره شـــیلان و خـــاتوو پـــەریخان

زۆر پـــــــێ دڵشــــــــاد بـــــــوون
ڕووخـــــــــــۆش و خەنـــــــــــدان

ئەمڕۆکـــــە ڕۆژی شـــادی هەموانـــــە
لــــەدایك بـــوونی (ڕازان)ی جوانــــە

هەولێر ٢٠٠٨/٧/٧

## ژینـــــۆ(*)

هەولێر ١٩٨٨

کچـــــــی ژیرمـــــــان ژینۆیـــــــە
بـــــۆن خۆشـــــە وەك لیمۆیـــــە
شـــــــیرینە وەك گەزۆیـــــــە
چـــــاوی نێرگـــــزی کاڵـــــە
کـــــوڵمی گوڵاڵـــــەی ئاڵـــــە!!

**

پرچـــــی ڕەشـــــە ڕەیحانـــــە
لێـــــوی ئـــــاوی ژیانـــــە
شـــــۆخ و شـــــەنگ و جوانـــــە
بۆیـــــە هیوامـــــان پێیـــــە
نامـــــەی دووا ڕۆژی پێیـــــە!!

**

ژینۆمـــــان پـــــۆلی ســـــێیە
چەنـــــدە بـــــەڕێ و جێیـــــە!
پـــــێم نـــــاڵێن کچـــــی کێیـــــە؟
کچـــــی ئەلوەنـــــد و کۆیـــــە
بیـــــر گەشـــــە وەك ئاســـــۆیە!

---

(*) بۆ ژینۆی کچی جەوهەری کاکەی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە گوتراوە کە لە تەمەنی ٨ ساڵان بووە.

# کۆیه

## شاری ئەدەب و هونەر و ڕاپەڕین

هەولێر ١٩٩٠/١/١٥

کۆیـــــەی خـــــەبات و شـــــاری ڕاپـــــەڕین
شـــــاری قوربـــــانی و شۆڕشـــــی خـــــوێنین

شـــاری قاصـــید[١] و حـــاجی[٢]و ئـەختـــەره[٣]
ســـــەرچاوەی علـــــیم و شـــــیعر و هونـــــەره

خوێنـدنگای کـەیفی[٤]و جێـی شـێخ رەزایـە[٥]
شـــــارەکەی جـــــەلی زادەی[١] زانـایـــــە

---

(١) قاصـید: نازنـاوی شـاعیری بـەکراغای حەوێزییـە کـە لـەنێوانی سـالآنی ١٧٨٥-١٨٥٣ دا لە کۆیە دا ژیاوە.
(٢) حاجی: حاجی قادری کۆیی (١٨١٧ -١٨٩٧).
(٣) ئەختــەر: نازنـاوی شـاعیریی ئـەمین ئاغـای کـوڕی حـاجی بـەکراغای حەوێزییە (١٨٣٩-١٨٨٨).
(٤) کـەیفی: مەبەسـتی لـە شـاعیری کـورد فـەتحوڵلای جـوانڕۆیی ناسـراو بـە کەیفی یە (١٨١٥-١٨٨٣).
(٥) شێخ ڕەزا: مەبەستی لە شاعیری ناسراوی کورد شێخ ڕەزای تاڵـەبانی یـە کە ماوەیەکی زۆر لە کۆیەدا خوێندوویەتی (١٨٣٤ -١٩١٣).

شـــــاری حــــــەماغاو[٢] جەمیلاغایــــــە[٣]،
هەوارگــــەی مــــەلای گـــەورەی[٤] دانایـــە

شــاری حوســەینی[٥]و ســامی[٦] و مەنفیــە[٧]
چاوگـــەی ئیلهـــامی شـــیعری صــافیە[٨]

---

(١) جەلی زادە: مەبەست لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەیە کە زاناو شاعیرێکی بە توانای کورد بووە (١٨٣٤ – ١٩٥٨).
(٢) حەماغا: مەبەستی لە حەماغای کوڕی مەحموود اغایی غەفووریيە، (١٨٣٩ – ١٩٢٠).هاوچەرخی ئەمین ئاغای ئەختەر بووەو لە ساڵانی (١٩١٨ – ١٩٢٠) حاکمی ئیداری کۆیە بووە.
(٣) جەمیلاغا: مەبەستی لە جەمیل ئاغای کوڕی حاجی ئەسعەداغای حەوێزییە کە لە (١٩١٨ – ١٩٢١) جێگری حاکمی ئیداری کۆیە و حاکمی ئەو شارە بووە و (١٩٢١ – ١٩٣٢) قائیمقام بووە.
(٤) مەلای گەورە: مەلا محەمەدی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەیە کە ناسراو بووە بە (مەلای گەورە)( ١٨٧٦ – ١٩٤٣).
(٥) حوسەینی: مەبەستی لە سەید ئەحمەدی کوڕی شێخ کەریمی بەرزنجی یە کە ناسراوە بووە بە حوسەینی شاعیر.
(٦) سامی: مەبەستی سامی عەودالە کە ناوی تەواوی مەلا حوسێنی بابە ڕەسوول بووە و لە نێوانی ساڵانی (١٩١٠ – ١٩٨٥) دا ژیاوە.
(٧) مەنفی: مەبەستی شاعیر مەلا ڕەسوولی مەلا مەحموودی بێتووشی یە، کە لە نێوانی ساڵانی (١٨٥٠ – ١٩٢١) لە کۆیە دا ژیاوە.
(٨) صافی: نازناوی شاعیری غەزەلی کورد، شێخ مستەفای شێخ عەبدوڵڵای هیرانی یە، (١٨٧٦ – ١٩٤١).

مەڵبەندی عاصی[١] و زەکی[٢] و ڕۆستەمە[٣]
دوور لە ناکۆکی و خەفەت و خەمە

شارەکەی عەونی[٤] و مەیلی[٥] و دڵدارە[٦]
جێی دلاوەر[٧] و راجی[٨] و دڵزارە[٩]

---

(١) عاصی: نازناوی شاعیری کورد مەلا مستەفای مەلا ڕەسوڵە کە لە نێوان ساڵانی (١٨٨٧- ١٩٧٥) دا ژیاوە.
(٢) زەکی: مەبەستی لە محەمەد زەکی ئەحمەدی هەناری یە کە لە نێوانی ساڵانی (١٩٠٩ – ١٩٦٧)دا ژیاوە.
(٣) ڕۆستەم: نازناوی شاعیریی محەمەد نافیع عەبدولفەتاحی حەوێزی یە لە ساڵانی (١٩١٣ - ١٩٩٩) دا ژیاوە.
(٤) عەونی: نازناوی شاعیریی عوسمان حەبیبە و لە ساڵانی (١٩١٤ – ١٩٩٢) دا ژیاوە.
(٥) مەیلی: مەبەستی لە مەلا سابیری مەلا حەبیبە و نازناوی شاعیریی (مەیلی) بووە.
(٦) دڵدار: مەبەست لە شاعیریی ناوداری کورد یونس ڕەئووف مەلا مەحموودی خادیم سوجادیە (١٩١٨- ١٩٤٨).
(٧) دلاوەر: نازناوی شاعیری لێ هاتووی کورد مەلا محەمەدی مەلا برایمی عەولائالانی یە (١٩٠٩-١٩٧٠).
(٨) راجی: نازناوی شاعیریی مەلا عەبدورەحمانی کوڕی (برایم)ی جافی میکاییلیە کە ژیانی فەقێیەتی لە کۆیە بەسەر بردووە.
(٩) دڵزار: ئەحمە مستەفای حەوێزی شاعیری ناسراوی کوردە و لە ساڵی ١٩٢٠ دا لە کۆیە لە دایك بووە تاکو ئەمڕۆ لە ژیاندا ماوە.

شـــاری مســـکین[(١)] و شـــێرکۆ[(٢)] و ئـــەنوەرە[(٣)]
جێگــــەی خۆشـــــناو[(٤)] وردی[(٥)] ڕەنجـــــدەرە

شـــاری شـــارەزا[(٦)] و ئاشـــنا[(٧)] و غـــەمبارە[(٨)]
جێگـــەی بـــرژاو[(٩)] و پشـــکۆ[(١)] و جۆبـــارە![(٢)]

---

(١) مسکین: نازناوی شاعیریی محەمەد حەمدی سەرتاش بووە کە لە ساڵانی (١٩٢٠-١٩٤١) لەکۆیە ژیاوە.

(٢) شێرکۆ: نازناوی کامیل بەهجەت حەوێزی شاعیر بووە کە لە ساڵی ١٩٢٠ دا لە دایك بووە لە ١٩٤٥ دا کۆچی دوایی کردووە.

(٣) ئەنوەر: مەبەست لە شێخ ئەنوەری سەید ئەحمەدی بەرزنجی یە کە لە ساڵی ١٩١٩ لە کۆیە لەدایك بووە و ئێستا لە هەولێر دەژی.

(٤) خۆشناو: مەبەست لە عوسمان مستەفا خۆشناو کە لە ساڵی ١٩٢٦ دا لە کۆیە لە دایك بووە و ئێستا لە هەولێر دەژیز

(٥) وردی: مەبەستی لە شاعیر و فۆلکلۆرستی کورد محەمەد تۆفیق وردی یە کە لە ١٩٢٤ دا لە کۆیە بووە لە ١٩٧٥ دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە.

(٦) شارەزا: (کەریم مستەفا محەمەد حەوێزی)یە، لە ساڵی ١٩٢٨ دا لە کۆیە لە دایکبووە و ئێستا لە هەولێر دەژی.

(٧) ئاشنا: نازناوی شاعیری لاو جەباری مەلا کەریمە کە لە ساڵی ١٩٣ دا لە کۆیە لە دایك بووە و لە ساڵی ...... دا لە ڕانیە کوژراوە.

(٨) غەمبار: مەبەست لە شاعیر کەمال حوسین غەمبارە کە لە ساڵی ١٩٣٧ دا لە کۆیە لە دایك بووە و ئێستا لە هەولێر دەژی.

(٩) برژاو: نازناوی شاعیریی سەید ئیبراهیمی سەید سەعیدە لە ساڵی ١٩٢٦ دا لە کۆیە لە دایك بووە و هەر لەو شارەشدا لە ساڵی ١٩٩٨ دا کۆچی دوایی کردووە.

شـــــيعری دلێـــــر[٣] و مەجيـــــد ئاســــنگەر[٤]
بـەرنـامـەنـــــــە بـــــۆ كـــــوردی تێكۆشـــــــەر

شـــــيعری ئـــــازاد[٥] و قوبـــــاد[٦] و بيمـــــار[٧]
گـــــوڵی بـــــژاردەن لـــــە باخچـــــەی بـــــەهار

**

(١) پشكۆ: نازناوی عوسمانی عومەری مام يەحيايە و سەردەمێكيش نازناوی (ئاگر)ی بۆ خۆی دادەنا، لە ساڵی ١٩٣١ لە كۆيە لە دايك بووەو لە ٢٠٠ دا لە شاری هەولێر كۆچی دوايی كردووە.
(٢) جۆبار: نازناوی شاعير جەلال سەعيدە لە ساڵی ١٩٢٩ دا لە شاری كۆيە لە دايك بووەو ئێستاش لەو شارەدا دەژی.
(٣) دلێر: نازناوی شاعيری ناسراوی كورد و مەقامبێژ، خاليدی واحيد موختارە ل ساڵی ١٩٣٣ دا لەكۆيە لە دايكبووەو ئێستاكە لە سلێمانی دەژی.
(٤) مەجيد ئاسنگەر: مەبەستی ل شاعيری كورد مەجيد ئەحمەد ئەسنگەرە، لە ساڵی ١٩٣٢ دا لە كۆيە لە دايكبووەو ئێستا لە لە شاری هەولێر دادەنيشێ.
(٥) ئازاد: مەبەستی لە ئازاد ئەحمەد دڵزارە، لە ساڵی ١٩٤٧دا لە كۆيە لە دايك بووەو ئێستا لە هەولێر دادەنيشێ.
(٦) قوباد: مەبەستی لە قوبادی ئيسماعيلی مەلانووری جەليزادەيە كە ناودارە بە (قوبادی جەليزادە) و شاعيرێكی نوێكاری كوردە (١٩٥٤) لە دايك بووە.
(٧) بيمار: مەبەست لە عەبدولرەزاق بيمارە و شاعيرێكی توێكاری بە توانای كوردە، لە ساڵی ١٩٣٦ دا لە كۆيە لە دايكبووە.

جێـــی شـــایی نـــەورۆز لـــە تاتووکانـــە[1]
ژوانگـــەی دڵـــداران کـــانیێ بســـکانە[2]

چیـــــای بـــــاواجی و هەیبەســـــوڵتانی[3]
ســــــەیرانگاکانی شـــــیوی ڕەزانـــــــی

ڕەزی پلووســـــك و ئۆمـــــەر خوچـــــانی
هەرمۆتـــــەی خـــــۆش و بـــــاغی ئاشـــانی[4]

شـــــایەدی دەدەن ئـــــەم شـــــارە جوانـــــە
بەهەشـــــتی خوایـــــە لـــــەم کوردســـــتانە

شـــــاری هونـــــەر و گـــــۆرانی خۆشـــــە
جێـــی هونەرمەنـــد و نەغمـــەی بـــە جۆشـــە

(١) تاتووکان: شوێنی ئاهەنگی نەورۆز بووە لەکۆیە و کەتۆتە لای ڕۆژئاوای شارەکە.
(٢) کانیێ بسکان: کانیەکی سازگارە کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی کۆیە لە بەری لای چەپی ڕووبارەکەی.
(٣) باواجی و هەیبەسوڵتان: دوو چیای بەرزن لەلای ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژهەڵات دەوری شاری کۆیەیان داوە.
(٤) ڕەزی بلووسك و ئۆمەرخوچان و هەرمۆتە و باخی ئاشان: چوار سەیرانگەی دڵگیری شاری کۆیەن.

شاری مەڕبین(١) و عەبەو(٢) حەنیلە،(٣)
ناو بانگیان بەرزە وەکو قەندیلە!

مەقامەکانی سێوەی(٤) هونەرمەند
خۆراکی گیانین بۆ مرۆی هۆشمەند

دەنگی مەلاسعەد(٥)، خۆش بەختی دەڕواند
کاتێ وەك بولبول کە تێی دەچریکاند

تایەر(١) و نەغمەی (شیرین بەهارە)
خەڵاتی خودای پەروەردگارە!!

(١) مەربین: مەبەستی لە مەقامبێژی هونەرمەند مەربێنی قەشە شابیلە کە لە ساڵی ١٨٤٥ لە کۆیە لە دایك بووە و لە ١٨٩٥ دا هەر لەو شارەدا کۆچی دوایی کردووە و هاوچەرخی ئەمین ئاغای ئەختەر بووە.

(٢) عەبە: مەبەست لە مەقامزانی بەتوانا عەبەی چایەچی یە.

(٣) حەنیل: ناوی حەننا تۆما بووە و بە (حەنیلە خڕە) ناسراوە مەقامزانێکی لێ هاتووی کورد بووە و مامۆستای سێوە بووە.

(٤) سێوە: مەبەستی لە سێوەی کوڕی یەڵدە بووە کە گەورەترین مەقامبێژی بەهرەداری کورد بوون (١٨٩١ – ١٩٦٣).

(٥) مەلا ئەسعد: مەبەستی لە مەلا ئەسعەدی مەقامزانی بەهرەدارە کە لە ١٨٩٠ لە کۆیە لە دایك بووە و ١٩٥٨ دا کۆچی دوایی کردووە.

بەسـتەی بـاكووری[٢] و تیپـی بـاواجی[٣]
شـادییان خسـتۆتە شـارەكەی حـاجی

نەغمـەی كـەمانی زاهیـر محەمـەد[٤]
لەگـەڵ ئـاوازی نـای سـەردار ئەحمـەد[٥]

شـارەكەی كۆیـان كـردە خوێنـدنگا
لـە بـۆ فێربـوونی فـەننی مۆسـیقا

**

(١) تایەر: مەبەستی لە گۆرانبێژی هونەرمەندی كورد (تایەر تۆفیق)ە كە لە ساڵی ١٩٢٢ لە كۆیە لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٨٧ دا كۆچی دوایی كردووە.

(٢) باكووری: (ئەندریۆس ئیسرائیل خەممۆ)ی مۆسیقازان و گۆرانی بێژی ناوداره لە ١٩٢٨ لەكۆیە لە دایك بووە و ئێستا لە هەولێرە.

(٣) تیپی باواجی: تیپێكی مۆسیقایە، یەكەم جار وەك تیپێكی قوتابخانەی ناوەندی كوڕانی كۆیە لەلایەن باكووری یەوە دامەزراو لە دوایی دا پێشكەوت و ناوبانگی هونەری دەركرد.

(٤) زاهیر محەمەد: یەكێكەلە مۆسیقازان و ئاواز دانەرەكانی كورد و لەسەر دەستی باكووری فێرە مۆسیقا بووە و لە دوایی دا لە حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو دا بۆتە سەرۆكی تیپی باواجی كۆیە.

(٥) سەردار ئەحمەد: یەكێك بوو لە نای ژەنە ناودارەكانی كورد لەسەر دەستی باكووری فێری مۆسیقا بووە، ئێستا یەكێكە لە مۆسیقارە دیارەكانی كورد.

ئـــــافرەتی کۆیـــــە نـــــاودار و دیـــــارن
زیرەکـــــو هۆشـــــیار، ئـــــازا و بـــــەکارن

حـــــەکیم و زانـــــاو شـــــێری ژیـــــانن
نـەنکـــە ســـوراحی[1] و حـەزینـــە خـــانن[2]

نـەجیبـــــە خـــــانی[3] زیـــــرەك و دانـــــا
گـــولّی مـــەجلیس بـــوو لـــە نـــاو ژنانـــا

ئامینـــــە خـــــانی حـــــاجی حـــــەماغا[4]،
شـــێرە ژنێـــك بـــوو بـــە جـــەرگ و ئـــازا

---

(١) نـەنکـــە ســـوراحی: کچـــی حـــاجی بـــەکراغای حـــەوێزی یـــە و نـــەنکی شـاعیرە(مەبەست کـەریم شارەزایە ك.ك.شارەزا) ئـافرەتێکی شـاعیر و دەستی پزیشکی میللی بووە لـە ساڵی ١٨٤٦ لـە دایك بووە و لـە ساڵی ١٩١٤ دا کۆچی دوایی کردووە.

(٢) حـەزینـە: نازناوی شاعیریی (خاتوو زەینـەبی شێخ کـەریمی بـەرزنجی)یـە و هاوسەری حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە بووە لـە ساڵی ١٨٦١ دا لـە کۆیە لە دایك بووەو لە ساڵی ١٩١٨ دا کۆچی دوایی کردووە.

(٣) نـەجیبـە خـان کچـی مەلامحـەمـەدی کـۆیی (مـەلای گـەورە) بـوو، یـەکـەمین ئافرەتی کورد بووە لە قوتابخانەی کوڕانی خوێندووە، لـە ساڵی ١٩١٧ دا لە دایك بووە و لـە ١٩٩٩ دا لـە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

(٤) ئامینـە خـانی کچـی حـاجی حـەماغا هاوسـەری بـەکر عەبدولکـەریم حەوێزی بووە، ئافرەتێکی تێکۆشەر بووە، (١٩٣٠-١٩٧٥).

عەییشـــە گڵووکـــەی[1] مـــەردی بـــێ هاوتـــا
وەکـــو شـــێر لـــە ڕووی جـــەللادی وەســـتا

خـــــاتوو فرشـــــتەی[2] دانـــــای ڕۆشـــــنبیر
لـــــە ڕێگـــــەی خـــــەبات بـــــەڕاو تـــــەگبیر

لەتێکۆشـــــــانا بەدەســـــــت و بـــــــردە
نموونـــــەی دیـــــاری ئـــــافرەتی کـــــوردە

لـــــە حەقیقـــــەتی ئـــــەم زانیارییانـــــە
بۆمـــان دەرکـــەوت ئـــەم شـــارە جوانـــە

کۆیـــــە هەوارگـــــەی خۆشـــــیی ژیانـــــە
شـــاری ئـــەدەب و جێـــی تێکۆشـــانە!!

(١) عەیشە گڵووکە: دایکی تێکۆشەر محەمەد حەللاق بوو نهینی حزبەکەی نەدرکاند و ڕژێمی بەعس لە سێدارەی دا، لە ساڵێ ١٩٢٨ لەکۆیە لەدایك بووە و لە ١٩٨٨ دا لە سێداردراوە.
(٢) فریشتە: نازناوی شاعیریی و بزووتنەوەی نیشتمانی بوو" شاعیر و ڕۆشنبیرەو لە ساڵی ١٩٢٦ دا لە کۆیە لە دایك بووە و تا ئێستا لە ژیاندا ماوە و لە شاری هەولێر دەژی، ناوی تەواوی خەدیجە مستەفا حەوێزی یە.

## مانگرتووەکان(*)

هەولێر ١٩٩١/١٢/١٣

مانگرتووەکان
ئەی مەشخەڵە گڕگرتووەکان
قاڵ بووی خەبات و تێکۆشان
ئەی دلێرە نەبەزەکانی
ڕێی ژیان!!
**
مانگرتووەکان
مانگرتنتان ڕێی ڕاستە بۆ
سەرکەوتنتان
مانگرتنتان
وزەیەکی پۆڵابییە
بۆ بڕینی ڕێگەی سەختی
پێشکەوتنتان
**
مانگرتوەکان
ئێوەن شەبەقی خوێناوی
ئاسۆی بەیانیی هەژاران

(*) بەبۆنەی مانگرتنە سەرتاسەرییەکەی کۆتایی ساڵی ١٩٩١ گوتراوە. (ك. ك. شارەزا)

ئێوەن شیفاو
دەرمانی دەردی بێ چاران
ئێوەن شادی و
بزەی سەر لێوی غەمباران!!
ئێوەن مایەی
مەرگ و نەمانی زۆرداران
**
مانگرتووەکان
ئەی مەشخەڵە گڕگرتوەکان
ئێوەن ڕووناکی ڕێی تاری
کاروانی کوردی تێکۆشەر
ئێوەن هێزی
دەست و بازووی
پێشمەرگەی ئازای کۆڵنەدەر!!
**
مانگرتووەکان
پشتیوانی هەژاران و
بێ بەرگە سەرما بردووەکان

ئێوەن هێزی تۆڵە سێنی
شەهیدەکانی
هەڵەبجەو ئەنفالەکان
ڕزگارکەری
زەحمەتکێشە ژین تاڵەکان
پشتیوانی
ڕەش و ڕووت و ڕەجاڵەکان!!
**
مانگرتووەکان
ئێوە سەد جار
لە نەیارە هەڵاتووەکان
ئازاترن !
ئێوە لە گشت تێکۆشەرێك
کارا ترن
ئێوەن پێشمەرگەی کوردستان
لە جەللادانی دکتاتۆر
مەزنترن، باڵاترن
ئێوەن کلیلی دەروازەی
بەهەشتی پاشە ڕۆژی کورد

ئێوەن شۆڕشگێڕی نەبەرد
جێی شانازیی درشت و ورد !!
**
مانگرتووەکان
دلێرە هێرش بەرەکان
درەختی بەرزی ورەتان
ڕەگ و ڕیشەی
لەخاك و خوین چۆتە خوارێ
هەڵناکێشرێ
بەدەست و مەچەکی پیسی
هیچ زۆردارێ!!
**
مانگرتووەکان
ئێوەن بڵیسەی ئازادی
بۆ یەخسیر و بۆ گرتووەکان
ئاڵاکەتان
ئاڵای ئازادی و ژیانە
لە ئاڵای نزمی فاشییەکان

شەکاوەتر، بەرزترە!
باخی ژینتان
لە لێڕەواری دوژمنان
ڕازاوەتر، تەرزترە!!
**
مانگرتووەکان
قارەمانە سەرکەوتووەکان
ئێوە هەردەم
کێوێکی سەخت و سەرکەشن
بەهیچ هێزێك ڕاناقەنێن
ئەوەند چەسپاو و قایمن
بە هەزار موشەك و بۆمبا
ناجوولێن و هەڵناتەکێن
ئەوەند ڕەق و خۆ ڕاگرن
تا هەتایە لە ناو ناچن
هەردەمێنن
مەرگ دەمرێ ئێوە نامرن
ئێوە لە مەرگ قایمترن!
**

مانگرتووەکان
مەردە هەمیشە زیندووەکان
ئێوە هەردەم
لە ناو ویژدانی مێژوودا
جاویدانن !!
فرشتەی باغی بەهەشتی
نیشتمانن
بەڕاستی ڕۆڵەی بەجەرگی
گەلی کوردی قارەمانن
جێی شانازیی
ئازادیخوازانی دنیا و
کوردستانن !!

## کارەساتی دایکێک

هەولێر ١٩٩٤/٥/٢٤

**

من دایکێکی
کلۆڵی بێ پشت و پەنام
ساڵە هایە دەر بەدەرم
بێ کەس و بێ ڕێگەو جێگام!!
ئافرەتێکی خانەدانم
دەست ڕەنگینێکی کابانم
نەك بۆ ماڵی خۆم بۆ غەیرە
کەنیزەکم
بۆ خزمەتی نە یاران و ماڵە گەورە!
لە دایکبووی سەردەمی زووم
کچی شۆخ و شەنگی مێژووم
هەر پیر دەبم و گەنج دەبمەوە
دەبمەوە بووکی یەك شەوە!!
لە پاش حەووا
لە پێش کچی تورك و عەجەم
لە پێش خەنسا
بە حەڵاڵی شووم کردووە
هاوسەری خۆم خۆش ویستووە

جارەها زگم کردووە
کۆرپەی جوانم لە کۆش ناوە
بەناز بەخێوم کردووە
بەڵام هەر جارە دوژمنێك
هەر زوو لە ناوی بردوووە!
ڕەواندز و سلێمانی
قەڵادزێ و
هەڵەبجەکەی کیمیاباران
جێگای تاوانی دوژمنن
گۆڕستانی بە کۆمەڵی
جەرگی منن!!
**
لە دوای هەڵدانەوەی پەردەی
ئەم دراما و مەرگەساتە
دڵتەزێنە
پاش ئەو هەموو ڕەنجەڕۆیی و
کارەساتە بەر توێنە
ئاهوورە مەزدای میهرەبان
خوای خێر و ڕووناکی و ژیان
بۆ دووا جار
ئاورێکی پڕ بەزەیی لێ دامەوە
بەرەو سەرچاوەی جاحێڵی

گەڕامەوە !!
دوای زەبوونی
دوای ئەشکەنجەو ژان و ژوار و
شەونخوونی
کۆرپەیەکی یەگجار شیرینی
پێ بەخشیم
بوو بە مایەی کامەرانی و خێر و خۆشیم
گوتم: ئۆخەی!
وا ئەمجارەش کۆرپەی نازم
گرتە باوەش
بۆیە بە ڕوح دەیپارێزم
ناهێڵم دوژمنی دڵ ڕەش
بیخنکێنن!
دیسان جەرگم بووستێنن!!
**
کەچی ئەمجارەدوژمن نا
کەس و کارم
پاش تەگبیر و مشوور گێڕان
پەیتا پەیتا هاتنە سەردان
کۆرپە ناسکە خنجیلەکەم
کچە جوانە نەشمیلەکەم!
یەکیان بەرگی سەوزی هێنا

بیکاتە بەر
یەکیان زەردی بەسەردا دا
یەکیان سووری کردە تارا
زۆر بە کپی
ئەوانی تر شین و سپی
نەدی و بدی
کردیانە شەڕ
سەردەمێك بە تیغی زمان و
دەمێکیش بە نووکی خەنجەر
هەر کەس دەیویست بۆ خۆی ببا
یەکێك پیلی ڕادەکێشا
یەکیان قاچی
یەکێکیش سەری دەپێچا
دەیگوت: کچە مێینە یە
مێینەش نەزەر حەرامە
بۆ ئایینمان
ئەمە دەستوور و نیزامە!!
یەکێك دەیگوت: دیموکراسی
لە جیاتی خامەك و مۆزلین
دەکەمە کەوا و کراسی!!
ئەمە مۆدەی ڕۆژئاوایە
پەسەند کراوی دنیایە!

یەکێك دەیگوت:
((نەخێر دەبێ
بە ڕێگایەکی زانستی
پەروەردەی کەین
بە باوەری سۆسیالیستی!))
یەکێ ڕیش سپیش دەیفەرموو:
ئەگەر کچمان لەسەر دەستووری بێگانە
بە خێون بکەین
خیلافی شەرع و ئیمانە
دەبێ بە پێی
داب و نەریتی پێشینان
بیخەینە سەر
ڕێگەی ژیان!!
سەرنجم دا کار وا بڕوا
کەس و کارم بەشەڕە ڕەنگ
بە هێمنی
یا بە هەڕەشەو زەبر و زەنگ
کۆرپەی نازم لە ناو دەبەن
ڕەنج و گەنجم بە با دەدەن!
**
گەر ئەمجارەش
جگەر گۆشەم

وەکو جاران لە ناو بچێ
ئەزموونێکەو لەدەست دەچێ!!
جارێکی دی
ئەم خەونەمان نایەتەدی
نە من بۆم هەیە زگ بکەم
نە ئاهوورەی خوداوەندەکەم
ئاورێکی دی
لە منی هەژار دەداتەوە
خەمی دڵی غەمگینی من
دەشواتەوە!!
لەدنیاش دا هێزێك نییە
لامدا لە دەردی بێ کەسی و
دەر بەدەری
ڕزگارم کا
لە مەرگە ساتی ژیانی
ڕەنجەڕۆیی کوێرەوەری!!

# پیلان و کارەسات

هەولێر ١٩٩٤/٦/١٧

**

ئەم ڕۆژگارە
چەند شوومە
چەندە چەوت و نا لەبارە؟!
بەرامبەر بە ئێمەی کڵۆڵ
چەند دژوارە؟
لە سایەیدا مردن دەڕوێ
شکوفەی زام دەپشکوێ
خەم دەبارێ
بۆیە دنیامان بە جارێ
لەماتەمە
ژینمان هەمووی خوێن و خەمە!
خانەی دڵمان تەنگو تارە
هەناسەمان ئاخ و دەردە
بولبولی ڕۆح
لە غونچەی ژیان بێزارە!
پرسەی فرشتەی ئاشتی یە
ماتەمی مەرگی ڕاستی یە!
کۆستێکی یەگجار مەزنە

شینی دۆست، شایی دوژمنە!!

**

مەرز و بوونی ئەم وڵاتە

نوقمی دەریای کارەساتە

کیوەکانمان

پۆشاکی خەمیان پۆشیوە

گوڵزارمان سیس و ژاکاوە

غونچەی شادی هەڵوەریوە

کێڵگەکانمان

ژەهراوی مەرگیان نۆشیوە

باڵندەکان لەسەر چڵ و

هێلانە بێ نازەکانیان

پەشۆکاون

بەرامبەر بەم کارەساتە

دۆش داماون

گەورەو بچووکی ئەم گەلە

خەفەتبار و پەرێشانن

گرفتاری

داوی پیلانی دوژمنن

نوقمی دەریای

خەمێکی قووڵی بێ بنن!!

**

کارەساتێکی تا بڵێی ترسناکە
هێزی شەڕ و وێرانکردن
باڵێ شوومی
کێشاوە بەسەر ئەم خاکە!
کوردستانمان
دایکێکی ڕۆڵە کوژراوە
ماتەمگێڕێکی ڕەش پۆشە
لەنێو ئەم خەم و خەفەتە
جەرگ بڕە
جەستەیەکی بە بێ هۆشە
چونکە قەت چاوەڕوان نەبوو
لەکۆتایی سەدەی بیستەم
لەجیاتی بێ کارەسات و
بێ دەرد و خەم بۆ خۆی بژی
تووشی دەردێکی گران بێ
دەردی شەڕی براکوژی!!
**
قسەی خۆش و ستایشی
ببێ بە نەفرەت و جوێن
خۆراکی ڕۆژانەی کوردمان
ببێ بە خوێن!
ڕۆڵەکانی نێو سەنگەری

مەردایەتی
پێشمەرگەی ڕێی کوردایەتی
وا زووو بە زوو
بە پیلانی ئەهریمەنی
بەدو بەد خوو
دەستیان بە خوێنی یەك سوورکەن
حاشاو نکووڵ
لە خەباتی ڕێگەی دوور کەن
**
ئەم دایکە دڵ میهرەبانە
خاکی پاکی کوردستانە
جگەر سۆز و
پارێزگاری هەموومانە
نایەوێ کورد
چی تر بۆ ئامانجی دوژمن
ببێ بە پرد
نایەوێ ڕۆڵەی شیرینی
چی دی لە زەڵکاوی پیسی
ئەم کارەساتە دا بژی
بۆیە هەردەم نەفرەت دەکا
لە ڕەوشتی ئەهریمەن و
لەخۆ کوژی!

چاوەڕوانی گۆدۆ یەکە
ڕۆڵەکانی ئەم وڵاتە
ڕزگار بکات
لەم پیلان و کارەساتە
ئەویش ئەو خەباتگێڕەیە
تێ بکۆشێ بە گیان و دڵ
بۆ تەبایی و برایەتی
حیزبایەتی تەسك بکات
بە قوربانی کوردایەتی!!

# پیلانی دوێنێ و ئەمڕۆ

هەولێر ١٩٩٤/٦/٢٣

گەر بپرسن لێم ئێوە چین؟
دەڵێم: ئێمە
گیانێکی شەکەت و شڕین
لە شو لارێکی بێ هێز و
سارد و سڕین
دڵێکی پڕ لە کۆڤان و
خەمی چڕین!
لەکاری دنیا تێ ناگەین
بە دەیان ساڵ
ئێمە جارێك ڕادەپەڕێن!!
**
ساڵە هایە
بۆ خۆمان نەء، بۆ دوژمنان
دەرگای وڵاتمان والایە!
بۆیە هەردەم
گیرۆدەی داوی خوای شەڕ و
دوژمنانین
قۆچی قوربانیی پیلانین!

**

نەك هەر ئەمڕۆ

لە ڕابردوو

بە درێژایی ڕێبازی کاروانی مێژوو

هەر کەسێ لەم خاکە هەستا

بۆ ئازادی ئەم وڵاتە

بەرامبەر بە دوژمن وەستا

خەڵکی نەفام و چڵکاو خۆر

خیانەتیان لەگەڵدا کرد

کەوتنە نێو داوی پیلان و

خۆیان بە جارێ ڕیسوا کرد

چوونە پاڵ هێزی بێگانەو

بۆی بوون بە پرد

تاوانێکی گەورەیان کرد

سەرکردەی خۆیان لە ناو برد!!

**

جاران باری دوژمنیشمان

دەخستە سەر ئەستۆی خۆمان

نەخشەو پیلانی بێگانەش

دەبوون بە تاوانی خۆمان

هۆی ڕووخانی دەوڵەتێکمان

هەر بە ناحەق

دەخستە ئەستۆی مەلایەك
یا فەتوایەك!!
کەچی پیلانی ئەمڕۆمان
یەگجار سەخت و سامناکترە
پیلانگێڕ زۆر گوناهبار و
نا پاکترە!!
**
جاران دوژمنی بێگانە
پیلانگێڕ بوو
کەچی ئەمڕۆ ئێمە خۆمان
نەخشەکێش و پیلانگێڕین!!
بۆ ڕیسوا کردنی میللەت
قارەمانی ئازا و شێرین
بزانین یاخود نەزانین
بەم کارە پیس و چەپەڵە
نۆکەرێکی خزمەتگوزاری سوڵتانین!!
کارەساتمان زۆر گەورەیە
کوشتارێکە خۆ کوژییە
زام و گوللە
کوژراو و پیاوکوژ خۆمانین!!
**
لە ناو خۆماندا نا کۆکین

نەفرەت لە یەکتری دەکەین
هەوێنی هەزار داستان و
سەرچاوەی سەدان چیرۆکین
لە هیچ شتێ ناگەینە یەك
دوو ڕەنگین لە ئاڵایەکدا
کەچی نابێ بە تەبایی
لەگەڵ یەکدا
وەکو پێویست
دەست لەملان بین
وەك دوو ئاشقی خۆشەویست!!
**
ئێمە دارێکی گەندەڵین
کرمی مەرگ و
کلکی تەور لە خۆمانە
بە دەستی خۆمان تێ دەچین!
پیلان گورگێکی برسی یە
دەم و کەڵبەی
لە نیو جەرگ و هەناومانە
بەڵام فێرین
لەگەڵ هەر کارەساتێکدا
بڵێین: نۆکەری بێگانە
پەنجەی پیسی لە گەڕ دایە و

لە نێومانە
ئەمە کاری
دەستەی تابووری پێنجەمەو
پیلانی داگیر کەرانە!
کەچی خۆمان پێ نازانین
سەرچاوەی گشت کارەسات و
کانگەی بەڵا
هەر خۆمانین!!
لەگەڵ یەکتر
بە ناو دۆستین، هاوپەیمانین
هەموو یەك دڵ و یەك گیانین
بەڵام ئەفسووس
هەڵوێستی ڕاستەقینەمان
پێچەوانەی گوفتارمانە!!
هەرچی دەیکەین
دژی قەول و بڕیارمانە!!
کامەی دەڵێین:
برای دڵسۆزی هاوخوێن و
هاو زمانە
دوژمنێکی یەگجار گەورەی
بێ ئەمانە!!
سەری دەنالێ بۆ کوشتن

چاوەروانی دەکا مردن
ئامادەین ورگی هەڵدڕین
دەستی ببڕین
پەنجەکانی بسووتێنین
بێ باکانە
دەماری گیانی هەڵبڕین!
دوای کوشتار و مەرگەساتیش
سروودی سەرکەوتن بچڕین!!
بڵێین: ((هەر ئێمەین سەرکەوتوو
جەنگاوەری ئازای نەبەرد
ئێمەین قارەمانی مێژوو!))
بەڵام دوای چی؟
کە دەست بڕا
پەنجەکانی بوون بە سووتوو
تازە بڵێین:
((با دەست لە ناو دەست کەین هەموو کوردین هەموو !!))

## ڕێگر و داگیر کەر

هەولێر ١٩٩٤/٧/١٤

**

گەر ڕێگرێك
پاتالێك یان چەند پوولێكمان
لێ بستێنێ،
یا زۆردارێك
كەمیك چیلەی باخ و ڕەزمان
ببەزێنێ،
بستی خاكمان
بە خورتی لەدەست دەربێنێ
هەموو دەبینە مووشەك و
لە ڕوویان دەتەقینەوە
دەستەی ڕێگر و زۆرداران
لە ناو دەبەین
ماڵی خۆمان دێنینەوە!!

**

بەڵام ئەگەر
دوژمنیك بێ و بەپای پیلان
بۆ مەبەستی گڵاوی خۆی
داگیر بكات

ولاتی باب و باپیران
سەروەریمان لە دەست بدات
کێو و دەشت و شارەکانمان
بکا بە جەرگەی کارەسات
کۆت و زنجیری دیلیمان
بخاتە مل
ماڵ و منداڵ ئەنفال بکات
چۆن ئێمەی ڕۆڵەی دڵسۆزی
کوڕی خەبات و ڕاپەڕین
لە پێناوی ڕزگاربوون و
سەروەریی خاکی نیشتمان
نابین بە گڕ و هالاوی
بۆمبای ئەتۆمی بێ ئەمان
لەناو نابەین
هێزی سوپای داگیرکەران؟
ناسووتێنین
تەخت و تاراجی دوژمنان؟!

## بنیات نانەوە

هەولێر ١٩٩٤/٧/١٦

**

ئێمە ڕۆڵەی کارەسات و
دەردو بەڵاین
لەگەڵ یەکدا
هەردەم ناکۆك و نا تەباین
دوژمنە گەورەی یەکترین
کەچی دۆستی
میللەتانی هەموو دنیاین
نازانین چۆن کاری خۆمان
هەڵسووڕێنین
کەچی لەکاری خەڵکی دا
نەخشە کێشێکی بێ هاوتاین

**

خەباتگێڕین
پێشمەرگەی ڕاست و دڵسۆزی
ڕێگای خێرین
لە پێناوی هەق و راستی
تێدەکۆشین
ساڵەهایە

تالاوی ئێش و ئەشکەنجە و
خەم دەنۆشین!!
بەڵام ئەفسووس
تێکۆشانی زۆربەی زۆرمان
بەرگی ڕیایە و دەیپۆشین
خەریکی عەیبی یەکترین
ئەوەی کەراست و دروستە
دایدەپۆشین!!
**
شۆڕشگێڕین
لە مەیدانی پێشکەوتن و گۆڕانکاریی
جەنگاوەرێکی دلێرین
دەمانەوێ هەموو شتێ
زوو بگۆڕین
کەچی هەرگیز نامانەوێ
داگیرکەرانی نیشتمان
خوێنمژان و چەوسێنەران
لە ناو بچن بە یەگجاری
میللەتی رووت و برسیمان
بنیات بنێ
ژینی شادی و بەختیاری!!
**

ئاشتیخوازین
دوژمنی کوشتار و جەنگین
لەکاروانی تەبایی و چاکە خوازی دا
هاوڕێبازین
بەڵام هەردەم
یاری بە ئاگری شەڕ دەکەین
ئاژاوەچین!!
هەموو دنیا
سەریان لە ئێمە سوڕماوە
نازانن چین!
بە ناو هەموو دۆست و برای هاوپەیمانین
ڕێگای چەوتی و ڕق و کینە
پێ نازانین
کەچی گۆشتی یەکتر دەخۆین
دۆستی مەرگین
دوژمنی ژین
هەر خەریکی فیتنەو شەڕی
براکوژین!!
**
نوێخوازین
دابو نەریتی باپیران
پێ شێل دەکەین

لە گشت داب و نەریتی خۆمان
نارازین!!
کەچی بەکارو کردەوە
پاشکەوتەو کۆنە پەرستین
رێگا لە پێشکەوتن دەگرین
دوژمنە گەورەی سەر بەستین!!
دڵسۆز و خزمەتگوزاران
ریسوا دەکەین
بەدکردار و نەیارانیش
دەپەرستین!!
**
بۆیە ئەمرۆ
ئێمەی فەوتاو
ئێمەی شێواو
لە مەیدانی خەباتی پڕ
لە چاو و راو
بوونمان تامەزرۆی گۆڕانە
گیانمان تێنووی
دارشتنەو و بنیات نانە
بنیات نانێکی پتەوی
بیرو باوەڕ
بنیاتنانی خەباتگێری

خۆ بەختکەرە
لە نۆژەن بنیاتنانەوەی
ئینسانی کورد
لەسەر بنچینەی پتەوی
ڕەوشت و خووی بەرز و بەهێز
وەك کێوی قەندیل و هەڵگورد
وەکو شوورای پۆڵاو ئاسن
بوەستێ بەرامبەر دوژمن
ڕزگار بکات
خاکی پیرۆزی نیشتمان
بنیات بنێ
بۆ گەلی کوردی قارەمان
کۆمەڵگای داد و یەکسانی
ژینی خۆشی و سەرفیرازیی و
کامەرانی!!

## پانۆڕامای برا کوژی

هەولێر ١٩٩٥/١/٥

**

کە منداڵ بووم
مامۆستاکەم فێری کردم
((ڕۆڵەی خاکی کوردستانم
ئەمن کوردم))
لەو کاتەوە هەموو ڕۆژێ
سەیری نەخشەی دنیام دەکرد
سەرنجم دەدا گشت لایەك
تەماشای ئاسیام دەکرد!
بەو هیوایەی نیشتمانێك
بەدی بکەم
کوردستانی لێ نووسرابێ
کیانێکی سنووردار بێ
لە دەوڵەتانی دنیا بێ
بەڵام ئەفسوس
لە سەر نەخشەی هەموو جیهان
نەمدی قەوارەی کوردستان!!

**

کە گەورە بووم

پتر لە خوێندن تێ هەڵچووم
تێگەیشتم ساڵەهایە
لەم دنیایە
ئێمەی کورد بۆ سەر بەخۆیی
تێدەکۆشین
تاڵاوی ئێش و ئەشکەنجەو
خەم دەنۆشین
بەرگی مەرگ و پۆشاکی ماتەم
دەپۆشین!
هەردەم دوژمنی ژێر دەستین
پەپوولەی گوڵی ئازادی و
پەروانەی گڕی سەربەستین
کەچی هەرگیز تێ نەگەییم
بۆچی ئێمە نابین بە شت
وا بەم جۆرە
پاشکەوتەو زەبوون و پەستین؟!
**
پاش دەیان ساڵ
خەباتی سەخت و بەرخودان
دوای ئەنفال و کیمیاباران
خەونیکمان دی
ئاسۆی هیوامان ڕووناك بوو

خەونەکەشمان زوو هاتە دی!
لە دوژمنانمان ڕاپەڕین
ڕامانماڵین
بە دەست و برد
داگیر کەری کوردستانمان
شار بەدەر کرد!
بووین بە خاوەن دەستەڵات و حوکمڕانی
بەو هیوایەی ئیتر بژین
بە ئازادی و کامەرانی!!
**
پەرلەمانمان هەڵبژارد و
وەزارەتمان پێکەوەنا
فیدرالیمان کردە دەستوور
ئۆتۆنۆمیمان فڕێ دا
چاوەڕوان بووین ئاسوودە بین
هەموو بژین وەکو برا
کەچی بووینە هێزی گەورەو
هێزی پچووك
گەورەمان بچووکی قووت دا
زلهێزەکان
پلەو پایەی حکوومەتیان
دابەش کرد پەنجا بە پەنجا

بەرژەوەندی حیزبایەتی
دەستی نایە بێنە قاقای
کوردایەتی
کەسێ نەبوو گوێ بداتە
گوزەران و
برسیەتی چینی هەژاران
لەلای هەندێ مافی مرۆڤ
بیرو باوەڕ بوونە دۆلار
چوونە گیرفان
لەسەر پارەی باج و خەراج
چارەنووسی کوردستانیان
لە دەڵاڵخانەی مێژوودا
کردە هەڕاج
لە هەر لایە
بوو بە پێشبڕکێی چەکداریی و
لەشکر کێشی و بە یەکدادان
بوو بە شەڕی براکوژی
مان و نەمان!!
وایان زانی ئەم کارەیان
زۆر ڕەوایە
شەڕێ حەقەو
شۆڕشی بیرو بڕوایە!

وەك دوژمنی بابە کوشتە
یەکیان قڕ کرد
خوێنی گەشی یەکیان فڕ کرد!!
**
پاش ئەو هەموو
یەخەگیری و کارەساتە
دوای ئەو خوێن و مەرگەساتە
پانۆرامای براکوژی
بۆی سەلماندین: لەبەر چی کورد
سەدان ساڵە تێدەکۆشێ
کەچی هیچی بە هیچ نەکرد!!

## خامەو گولله

هەولێر ١٩٩٥/١/١٦

**

لەو ڕۆژەوە کە ئێمە هەین
مامڵەت لەگەڵ
هەست و سۆز و وشە دەکەین
بەرو بوومی نووکی خامەو
نویشکی زەین
وتەی جوان و شیعری ناسك
پێشکەش بەهۆش و ئەندێشە و
سۆز و ویژدانی گەل دەکەین
ورە بەزریی و خۆ ڕاگریی
ڕێی تێکۆشان
پیشانی میللەتمان دەدەین
ئاشتیخوازین
نەفرەت لە شەڕ و شەڕ خوازیی و
گولله دەکەین
مافی مرۆڤ دەپارێزین
بۆ هەق خۆمان بە کوشت دەدەین
کورد پەروەرین
ڕۆڵەی راستی کوردستانین

دوژمنانی
ڕووەو چاڵی مردن دەبەین!!
بار و بارگەی سەرکەوتنمان
بەرەو لووتکەی کێوی ئاوات
بەسەر دەخەین!
**
زۆرمان گوت و
جگە لە دەستەی دڵسۆزان
کەس نەبوو گوێمان لێ بگرێ
گەلێك خەمی خەستمان هەڵڕشت
هەستمان نەکرد
گوێ بە ناڵەی دڵمان بدرێ
گەوهەری ئامۆژگاریمان
لە بازاری ئەقڵ و دانش
خستە مەزاد
کەسێ نەبوو لێمان بکڕێ
زۆرمان نووسی
چاوی کار بەدەستیك نەبوو

بیخوێنێتەوە و
کەڵك و سوودی لێ وەرگرێ
ڕێگەی ڕاستیی ئاسایشمان
خستە بەردەم شەڕ خوازەکان
یەکێك نەبوو بێتە سەر ڕێ
کەچی بۆ شەڕی خۆ کوژی
هەر جێ بە جێ
کەوتنە سەر پێ!
**
چونکە لەم قۆناغەی ئەمڕۆ
شاعیر، نووسەر، ڕۆژنامەنووس
لای دەستەی شەڕ
بێ ڕووەتن
بێ دوا ڕۆژ و بێ چارەنووس
بێ نرخ و سووك
بێ بەهاتر
لە فیشەکی گوللەی چرووك
**

چەکبازەکان
دەستەی شەڕ و شەڕخوازەکان
لایان وایە
بۆ چارەی سەرجەم گرفت و
کێشەی ژیان
تەنیا گوللە کاریگەرە
هەر کەسێکی چەك بەدەستە
شۆڕشگێڕی تێکۆشەرە
ئەو سەروەرە
لێکدانەوەی هۆش و ئەقڵ
هەولو ڕەنجێکی بێ بەرە!!
**
لایان وایە بەشەڕ و چەك
هەموو شتێ دەبڕێتەوە
دەرگەی شادی و خۆشی ژیان
دەکرێتەوە
**
بۆیە ئەمرۆ ئێمەی شاعیر

ئێمەی نووسەر
ئێمەی ڕۆڵەی
هەست و سۆز و بیرو باوەڕ
بەرامبەر بەو دژوارانە
وشەکانمان
دەکەین بە چاووگی ئاگر
بە بڵێسەی گڕی نەورۆز
ویژدانیان پێ دەسووتێنین
تاکو پێیان دەسەلمێنین
نووکی تیژی داهێنەری
خامەی شاعیر
بیری نووسەری خۆ ڕاگر
بالاترن، کاراترن
لە کاری چەوتی شەرخواز و
گوللە و ئاگر!!

## دوو جەمسەری دژ بە یەکی کێشەیەک

هەولێر ١٩٩٥/١/٢٧

**

من دوو کەسی دژ بە یەکم
لە کەسێکدا
دوو هەناسەی گەرم و ساردم
لە ناو قورگ و نەفەسێکدا
شەڕ کەرێکی ئاشتیخوازم
دەمێك پاکە
دەمێك پیسە
سەرچاوەی هۆش و ئەندێشەو
ڕاز و نیازم
ڕاست و چەوتن
بیرو باوەڕ و ڕێبازم!!

**

ئیمانداریێکی دڵسۆزی
ئاهوورە مەزدای مەزنم
شاگردێکی ناهەمەواری
ئەهریمەن و
رابەرێکی ڕێی مردنم!!
لە مزگەوت و خانەقادا

خوا پەرستێکی زۆر کۆکم
لە ڕێبازی حەق ناسی دا
من شێخێکم
گەیشتوومە پایەی بەرزی فەنافیللا!
دەتوێمەوە لە نووری خوا
کەچی لە گۆشەی مەیخانە
هاونشینی سەرخۆشانم
بەدکارێکم
لەگەڵ مەینۆشان هاوپێکم!!
**
ڕۆژێك بۆ تەلاری بەرزیی
نیشتمانم
ئەندازیار و بنیاتنەرم
ڕۆژێکی دی
گێرە شێوێن و تێکدەرم!!
هەر دەزگایەك
نیشانەی شارستانی بێ
بە گورجی وێرانی دەکەم
هەر ماڵێك گەر ڕەنگین و

ڕازاوە بێ
جێ بە جێ تالانی دەکەم
**
شەرم ناوێ
بەڵام هەر کاتێکی ویستم
برای هاوپشتم سەر دەبڕم
من بەم جۆرە
ئازادی و یەکسانی بۆ گەل
بە خوین دەکڕم
گوێ نادەمە
هیچ بانگەواز و داوایەك
من هەرگیز ناچمە بن باری
هیچ یاسایەك!!
قایلیش نابم بە هیچ سەرکۆنە و
سزایەك!!
**
دەمێك سپیم
دەروون ساف و پاك و گەشم

دەمێك ڕەشم
ڕۆژێك من خاوەن ویژدانم
بەرامبەر زۆر لێكراوان
زۆر بەڕەحم و دڵۆڤانم
ڕۆژێك لە ویژدان بێ بەشم
بێ بەزەییم
دڵ ڕەقم چەشنی قورقوشم!!
**
لە شێنەیی بۆكوژرانی مێرووڵەیەك
دڵەی ناسكم دادەخورپێ
بەڵام لەكاتی تووڕەیی
ڕادەپەڕم بۆ خوێن ڕشتن
بە گورجی دەكەومە سەر پێ
ژیان لای من
بێ بەهایە
دەكوژم دەبڕم
بە زەییم بە كەس دانایە!!
ناشێوێم و باكم نییە

((فرمێسك بە چاوم دانایە!))

**

دوو دیاردەی جیاوازی
دژ بەیێکم
لە کاتێکدا لەگەڵ هێڵی
چاکەو خێردا
لە مەیدانی خزمەتگوزاریی
میللەتدا
هێڵێکی ڕاست و هاوڕێکم
لە هەمان کات
لەگەڵ دوژمنی بەدکردار
هاوپەیمانی ڕاست و ڕێکم
بۆیە ئێستا
دوو جەمسەری کێشەیێکم!
لە دوو دیمەن خۆ دەنوێنن
بە چەشنی سێبەر و هەتاو
دێنە بەرچاو!!
منی دیاردە، منی جەمسەر
وەك جادوو و سیحری جادووگەر
لە یەك کاتدا

شەڕم ! ئاشتیم
درۆ و ڕاستیم
شایی و شینم
مەرگ و ژینم
بەڕاستی من دوو جەمسەری
کێشەیەکی
یەگجار سەیر و سەر سوڕمێنم
هەتا لە ژیندا بمێنم
لە ئەنجامدانی هەر کارێك
دانامێنم!!
ڕۆژێك پارێزگاری یاسام
ڕۆژێکیش گێرە شێوێنم
ئەمەیە جەوهەری بوونم
خووی شیرییە و
تێکەڵاوە لەگەڵ خوێنم
دەمێك شادی و خێر و خۆشی
دەمێك کۆڵێك
کارەسات و دەرد و بەڵا
بۆ کورد دێنم!!

# تەلاری نوێی کوردایەتی

هەولێر ١٩٩٥/٢/١

**

سالْە هایە
بە بێ وچان
بە باوەڕێکی بەهێزی
پڕ لە ئیمان
خەبات دەکەین
گەلی کوردمان
لەناو حزبی
جەماوەری دا ڕێکدەخەین
لەسەر ڕێبازێکی
ڕاست و
گەلێك پتەو
بە ڕۆژ و شەو
دەرسی ئەشقی
کوردایەتی
بۆدا دەدەین
لە ڕێگەی سەختی
تێکۆشان
تالاْوی ئێش و ئازار و

خەم دەچێژین
هەزاران قوربانی دەدەین
خوین دەڕێژین
گیانی خۆمان بەخت دەکەین
میللەت بەرەو
لووتکەی هیواو ئامانج دەبەین!!
**
کەچی سەد داخ
ئەوەی گوتمان
بۆ جەماوەری برسیمان
ئەوەی بە خامە نووسیمان
لە مەیدانی پیادەکردن
وەکو ویستمان وا دەر نەچوو
هەر زوو بە زوو
لەبەر هەڵەی
هەندێ کەسی بەدو بە خوو
جڵەوی کارو فەرمانمان
لە دەست دەرچوو!!
بۆ میللەتی چەوساوەی کورد

لـه وێرانكاریی بـەو لاوە
چمان نـەكرد!!
بـە كردەوەی نـاشیرینـی
هـەندێ كـەسی گێرە شێوێن
ئـەوەی هـەش بوو
لـە پـەیوەنـدیی
هـەست و سۆز و بـرایـەتـی
دۆڕاندمان و لـە كیسمان چوو!!
**
ئێمە گوتمان: حزب دەكـەین
بـە خوێندنگـایـەكی بـەرزی
ڕەوشت و خوو
بـە دەزگـایـەك دابین بكات
ژینـی سەر بـەرزیی بۆ هـەموو
بێنێتـەدی بۆ كۆمەڵانـی ڕەنجدەران
بۆ سـەرجـەمـی تێكۆشـەران
هـەموو ئـاوات و ئـارەزوو
كـەچی ئێمە
بـە بـێ ئـەوەی پـێ بزانین
میللـەتمان بـەرەو هـەڵدێری

نەمان و ڕێگەی مردن برد
هەر ڕەنجێکی کە دابوومان
بە فیرڕۆ چوو
هەر بەڵێنێك کەدا بوومان
درۆ دەرچوو!
لە جیاتی کرداری ڕاست و
کاری دروست وحەق بکەین
نەتەوەی خۆمان خۆش بوێ
جێگە بە دوژمن لەق بکەین
هەستاین خۆمان
وەك مەستێکی بێ هۆش و هەست
نەفامانە
جڵەوی کارو فەرمان و چارەنووسمان
زوو دایە دەست
ئەو دراوسێ بیانییە
تازە یارانە
کردماننە گەورەو دەمڕاستی ئەمڕۆمان
لە شەڕێکی برا کوژی
وەرگی یەکترمان هەڵدرێ
بە ئەنقەست، بە دەستی خۆمان

بەو کارە پڕ مەرگە ساتە
تاوانێکی نەتەوەیی گەورەمان کرد
لە جیهاندا
ناوی پاکی کوردمان زڕاند!
**
دوای ئەو هەموو کارەساتە
دڵتەزێنەش
نابێ هەرگیز ورە بەردەین
ئارەقەی نائومێدیمان
بۆ کورد دەردەین
دەبێ ئێمە بە تەبایی و برایەتی
لە نۆژەن تێ هەڵچینەوە
لە خەباتی حزبایەتی
لەسەر زەمینەی پۆڵایی و
ستراتیژێکی زانستی و مەردایەتی
بۆ میللەتی تێکۆشەرمان
بە بیرو باوەڕی ڕاست و
ئازایەتی
دابڕێژین
بنچینەی قایم و سەختی
تەلاری نوێی کوردایەتی!!

# ژیان ... ئەمڕۆ

هەولێر ١٩٩٥/٢/٥

**

ژیان ئەمڕۆ
مەرگەساتێکی سامناك و
دڵتەزێنە
لە دنیای ئێمەی چەوساوە!!
کێشەیەکی سەر سوڕمێنە
گرفتێکی زۆر ئاڵۆز و بە بڵاوە
لەبەر دەم ئێمە خوڵقاوە
**

ژیان ئەمڕۆ
خورپەی خەیاڵ و خەونێکە
جۆرە ڕایەڵ و تەونیکە
لەتان و پۆی
شەڕی ئاڵۆزیی چنراوە
بابەتێکە یەگجار سەیرە
لەسەدان توخمی دژ بەیەك
داڕێژراوە!!
**

ژیان ئەمڕۆ
ڕەنگدانەوەی سەردەمێکە
هەموو چەمکێکی شێواوە
لەم سەردەمە پەتی درۆ
گەلێك درێژ و قایمە
شیرازەی ڕاستی پچڕاوە
پێوانەی چاکە و خراپە
ئەمڕۆ بە جارێ گۆڕاوە
بنچینەی هەق لە زۆر لاوە
لە ژێر زەبری گورزی نا هەق
هەڵتەکاوە !!
**
ژیان ئەمڕۆ تێکۆشانە
ململانێی خێر و شەڕە
سەرکەوتن بۆ خێڕ خوازانە
نەفرەت بۆ بەد و بەدفەڕە
لەسەرەتا
سوودی دنیا

کەسی لۆتی و بێ عار دەیخوا
کەچی لە ئەنجامی کاردا
سەرکەوتن بۆ
ئابڕوومەند و تێکۆشەرە
زۆردار رەنجی هەژار دەمژێ
کەچی دوا ڕۆژ
بەری ڕەنجی هەوڵ و خەبات
بۆ ڕەنجدەرە!!

# تانک و تراکتەر

هەولێر ١٩٩٥/٢/١٨

**

لە تراکتەرێکیان پرسی
بۆچی ئەمڕۆ
بۆ هەڵدڕینی ورگی خاك
وا تامەزرۆی
هێندە برسی؟!

**

لە وەڵامدا
گوتی: ((جاران من تانکێك بووم
لەبەرەی جەنگ
چەکێکی زۆر کوشندە بووم
بە زەبر و زەنگ
سەدان پیرم لە ناو برد و
هەزاران لاوی شۆخ و شەنگ
گەلێك خوینم بە ناهەق ڕشت
چەندان خەڵکی بێ تاوانم
بە کۆمەڵ کوشت!!
لاشەو خوێنی کوژراوانم
دەرخواردی ورگی نەوسنی

ئەم خاکە دان
تا بە جارێ دەشت و دەری
بوون بە مەیدانی مەحشەر و
سوور هەڵگەڕان!!
**
بۆیە ئەمڕۆ
من لە ئاستی
ئەو گوناهـ و ئەو تاوانە
لەسەر شۆڕی و شەرمەزاریم
بەرامبەر بەو شەهیدانە
لوولەی تۆپە لە عنەتییەکەم
تواندەوە و کرد بە گاسن
بەکوێرایی چاوی دوژمن
زەوی و زاری ئەم وڵاتەی
پێ دەکێڵم
کرم و چقڵی زیان بەخشی
لەناو کێڵگەدا ناهێڵم
بەرو بوومی کشتوکاڵی
بە جوانی دەهێنمە بەرهەم
بۆخۆراك و بەرگی ڕۆڵەی
ئەو شەهیدانەی کە بوونە
قوربانی گوللەی تۆپەکەم!!

## ولاَتێكی بێ ناسنامە

هەولێر ١٩٩٥/٢/٢١

من خاكێكم
كێو و نەواڵی ئاگرین
ولاَتێكم
بێ ناسنامە! نام گرتە خۆ
نەخشەی زەمین
قەوارەیەكم بێ سنوور
عەردێكی زەوت كراوم
لە بازاڕی سیاسەتی
كۆن و نوێ فرۆشراوم
نیشتمانی
گەلێكی زۆر لێكراوم
من لاَتێكم
لە نێو هالاَوی دوزەخدا
سووتێنراوە
لاتێكیشم
هەردەم گیرۆدەو گرفتار
بە دەرد و بەلاَی ڕۆژگار

خوڵقاوی دەورو کاتیکم
پڕ لە ئاشووب و ئاژاوە
لە کوورەی ئەشکەنجەو ئازار
جۆش دراوم
لە نیو بۆتەی کێشەی سەختی
هەموو عالەم قاڵ کراوم
پەردەی خەم و
دیمەنی مەرگەساتێکم
لەم جیهانە جەنجاڵە دا
کارگەی تەون و
ڕایەڵی کارەساتێکم
بە نەخشەو پیلانی پیسی
زلهێزەکان
بە زۆرداریی بەش کراوم
لە کۆنەوە
ئۆردوگای هێزی دوژمن و
ڕێگەی سوپای بێگانەمە
بۆ تیر و گوللەی دوژمنان

من ئامانج و نیشانەمە!!
کیشوەرێکم پێشێل کراو
نموونەی زۆر لێ کراوی
بە دەیان دەورو سەردەمم
دیل و ژێر دەستی عارەب و
زەلیلی تورك و عەجەمم!
لە ڕابوردووم
لە ڕۆژانی گەشی مێژووم
ڕۆڵەکانم لە نەینەوا
شەڕکەری ئازاو جەسوور بوون
تیرەنداز و گورز وەشێن
ڕووخێنی حوکمی ئاشوور بوون
لە هەولێر،
هۆلاکو بەزێن!
لە فەلەستین
ڕزگارکەری شاری قودس و
هێزی خاچ پەرستان شکێن
**
لەم سەدەیەش

نیشتمانی ڕاپەڕینی
شێخ مەحموودی قارەمانم
جێی هەڵمەت و پەلاماری
شۆڕشگێڕانی بارزانم
مەیدان و کۆڕی نەبەردی
ئاگری داغ و ئەرارات و
شۆڕشی شێخی پیرانم
وڵاتی قازیی نەمر و
جێ سەنگەری شۆڕشەکەی
ئەیلوول و مانگی گوڵانم
مەتەرێزی فیداکاریی
شۆڕشی نوێی کوردستانم!!
**

ئێستاکەش من
نیشتمانێکی وێرانی
میللەتی ئەنفالکراوم
کێڵگەی مین و تێ ئێن تیمە
خاوەن هەزاران شەهید و
هەتیوی ڕووت و برسیمە

تاقیگەی چەکی کۆکوژ و
وڵاتی کیمیابارانم!!
شانۆی گەلێك مەرگەساتم
مەیدانی مەرگ و نەمانم
جەرگەی شۆڕشی خوێناوی و
تێکۆشان و خەباتێکم
بۆ سەر بەرزیی و بەختیاریی
ڕۆڵەکانم
قیبلەی هیواو ئاواتێکم
زێد و لانەی شۆڕشگێڕ و
دلێرانم
کەچی هێشتا
وڵاتێکی بێ ناسنامەی
نێو جیهانم
بێ دروشم و بێ ئاڵامە
لە ڕێکخراوی دەوڵەتاندا
بێ ناونیشان و جێگامە!!

## زامی دڵی کورد

هەولێر ١٩٩٥/٢/٢٥

من زامێکم گەلێك وێران
گەلێك بەژان
بەگجار سەخت و پڕ سفت و وسۆم
لە دڵی کورد
گەر لەجەستەی
هەر گەلێکی تر بوومایە
بێ شك دەمرد!!
زامی شەڕی براکوژی و
ماڵوێرانی
شەڕی دژی
کوردایەتی و شارستانی!!
بۆیە وا زامێکی قووڵم
بە قەد قووڵایی گۆلی وان
بە قەد دەریاچەی دوکان و
دەربەندیخان
بە قەد خەفەتی نیو دڵی
بێوەژنی هەژار و دایکی
شەهیدان

بە قەد خەمی
زەحمەتکێشی لانەوازی
برسی و بێ نان!!
**

من زامێکم گەلیك وێران
هەر وەکو گوند و دێهاتی
ئەنفال  کراوی کوردستان
وك شێخ وەسانی شەهید و
هەڵەبجەکەی کیمیاباران
چەشنی کۆڵێتی ڕووخاوی
ڕاگوێزراو و لێ قەوماوان
بە خوڕ وەك ڕووباری دۆڵی
کپ و پووڵی نێو چیاکان
وەکو سەیلاوی قەد شاخ و
لێزمەی باران
خوێنی هەموو شەهیدانی
ڕێی ڕزگاریی نیشتمانی
لێ دەچۆڕێ
هەموو گوناهی خەڵق و خوای
ئەم میللەتەی پێ دەشۆرێ

هەر چەند قەوارەم مەزن و
شەباقەم گەلێك وێران بێ
ئێش و ژانم زۆر گران بێ،
بەڵام چونکە زامی دڵێ
گەورەی کوردم
خۆ ڕاگرم
پتەوم وەك پۆڵاو بەردم
قیبلەی ئاواتم ناگۆڕێ
ڕەنجی خەباتی چەند ساڵەم
بە فیرۆ ناچێ و نا دۆڕێ!!
**
بۆیە ئەمڕۆ بە هیوامە
خەباتگێڕی
ڕاستەقینەی نەتەوەکەم
بە دڵسۆزیی هەوڵ بدەن
بە وەستایی
بە دەرمانی چارەساز و
بە هەتوانی برایەتی و
بە یەکگرتن و تەبایی
بە مەعلانی و شارەزایی

سارێژم کەن
شەڕی پیسی برا کوژی
تا هەتایە لە ناو ببەن
تاکومیللەت
بەتەبایی و ئاسوودەیی
لە نیشتمانێکی ئازاد دا
کامەران و تێر و تەژی
سەر فیراز و سەربەست بژی!!

# هەست و دڵی کورد

هەولێر ١٩٩٥/٢/٢٦

**

من چاوێکم
بە ناو پێلوومدا ڕۆچووم
یەگجار بێ هێز و کزبووم
ماندووم بە قەد
بیرو ئەندێشەی  شاعیران
بە قەد بازووی
چینی چەوساوەی ڕەنجدەران
بە ئێش و ژان
وەك ژیانی پڕ  ئەشکەنجەی
بە لەنگاز و تێکۆشەران
چاوێکی کول  پڕ گرێ و گاڵ
بە بێ چارە و داوو دەرمان
پڕ بەزەیی و پڕ لە گریان
بە لێشاوی فرمێسکی ئاڵ
گوناهەکانی خۆم نەبن
تاوانی گشت گوناهبار و
لە خوا عاسی پێ دەشۆرێ
باری ژیانی خۆم نەبێ

هەموو شتێ چاك دەبێت و
لەبەر نیگای من دەگۆڕێ!
**
گوێچکەیەکم
بۆ بیستنی خێر و خۆشی
خوا پێداوان
یا هەواڵی دڵتەزێنی
کارەساتی شەڕ و تاوان
گەلێك سووك و زۆر بەهەستم
کەچی بۆ خێر و خۆشیی خۆم
زۆر گرانم گەلێك تەپم
هیچ نابیستم
بە درێژایی ماوەی عومرم
هە تاکو ئەو ڕۆژەی دەمرم
تەنیا هەواڵی جگەر بڕ
بۆم دێن بە گوڕ
لە پەردەی من دێنە ژوور و
وەریان دەگرم!!
**

من دڵێکم
بە خورپەی خەم جۆش دراوم
گەلێك سەیرم
لەسەر خۆش ویستنی غەیرە
ڕاهێنراوم
بۆ خۆم نا، بۆ خەڵکانی تر
دنیای خۆشەویستی ڕاستی
ئەم ژیانەم
بە هەشتێکی
فراوانی ئەم جیهانەم
من شادی بۆ عالەم دەکڕم
ورگی دێوی خەم و تاڵی
خەڵکی دەدڕم
کەچی بۆ خۆم
کانگەی خەم و خەفەتێکم
دەماری شادی خۆم دەبڕم!
ئەگەر ساتێك خۆشی و شادیم تێ بگەڕێ
بەلادا دێم
یەکسەر دەمرم!!

ئێمە چاو و گوێچکە و دڵێ
مرۆڤێکین
پێی دەڵێن کورد
فیداکار و دلێر و گورد
بەڵام هەردەم
مات و غەمگین
دواکەوتە لە کاروانی ژین
مرۆڤێکە
بێ کەس و بێ پشتیوانە
هەموو دەورو بەری تەون و
ڕایەڵی نەخشە و پیلانە
مەکۆی دەستەی نەیارانە
خەباتگێڕە بە ڕۆژ و شەو
تێدەکۆشێ و قەت ناسرەوێ
خۆشی خۆی نا
خێر و خۆشی خەڵکی دەوێ
دابو دەزگای
حوکمڕانی بۆبێگانان
بنیات دەنێ
حوکمی دامەزراوی خۆیشی

لە ناو دەبا و دەرووخێنێ
بۆ میللەتان
ئاسایش و ئازادی و یەکسانی
دەوێ
کەچی بۆ خۆی
شەڕ و شۆڕی براکوژی و
شین و ماڵ وێرانی دەوێ!
بۆیە هەتا بە قەد خەڵکی
خودی خۆی و کێشەی ڕەوای
خۆی خۆش نەوێ
هەرگیز ناگاتە ئامانج و
سەرناکەوێ
بە یەکدەستی و بۆ یەك مەبەست
لە خەباتی نیشتمانی
تێ هەڵنەچێ
ئەوەی هەمیشە
لە بنەمای بوون و ژینی
بۆی نامێنێ و
لە دەست دەچێ!!

# کاسە سەری مێژوو

هەولێر ١٩٩٥/٢/٢٨

**

لە پێشوازی
کاروانی خەباتی گەلان
دەستەیەك لە مێژوو نووسان
بەنیازی تۆمارکردنی
ڕووداوی نهێنی مێژوو
لە بەردەم دەروازەی ژیان
دڵ پڕ لە تاسەو ئارەزوو
لە چاوەڕوانیدا وەستان
تاکو کاروان
گەیشتە جێ
کاتێ بە بەردەمیان ڕەت بوو
بینیان بارو بارگەی هەموو
لاشەی سووری شەهیدانە
دەست و قاچ و پشت و سەری
تێکۆشەری قارەمانە
سەر قافڵەچی ئەو کاروانە
کاسە سەرێکی مێژوو بوو
شایەدێکی موعتەبەری

چەرخی نوێ و
سەدەو سەردەمێکی زوو بوو
کاتێ کە گەیشتە قۆناغ
لێیان پرسی:
((باوکی بلیمەتی مێژوو
لەسەرەتای کەوتنە گەڕی
چەرخ و دەزگات
لەگەڵ دروست بوونی مرۆڤ
سەر هەڵدانی هەوڵ و خەبات
تاکو ئەمڕۆ
هەر لە عاردو بەرد و دەریا
نێو جەرگەی ئاسمان و ئاسۆ
تۆ چیت بینی ؟
چیت بەر گوێ کەوت
لەهەواڵی ئەم دنیایە
لە خەبات و تێکۆشانی
ئەم میللەتەو خەڵك و خوایە؟
لەو کێشە و ململانێیە
کێ دۆڕاندنی و کێ بوو سەرکەوت؟

کێ کەوتە دنیای بێ دەنگی
کێ بە دەر کەوت؟))
لە وەڵامدا کاسەسەری
دنیا دیتەی فەیلەسووفی
دانای مێژوو
بە دەنگێکی هەڵبزرکاو
ئەمەی فەرموو:
((ئەم دنیا
گەلێ سپڵەو بێ وەفایە
بەزەیی بەکەس دانایە!
سەد ساڵ تۆ خزمەتی بکەی
تێبکۆشی و
گەلێ قوربانی بۆ بدەی
بە بێ سوود و و بێ بەهایە
ئەنجامی ژین و خەباتت
شەهید بوونە
یا فەوتان و لە ناوچوونە
لەمەیدانی تێکۆشانی
چین و دەستەی میللەتانی

ئەم جیهانە فراوانە
گەلێك ڕووداوی خوێناوی و
هەزاران کارەساتم دی
چەند شۆڕش و ڕاپەڕین و
چەند شەڕ و مەرگەساتم دی!!
بەڵام هیچیان
بە قەدەر شۆڕشی کوردان
لاشەو گیان هەڵوەرێن نەبوو
هیچ ڕووداوێکی خوێناویش
هێندە زل و
سامناك و دڵتەزێن نەبوو
چونکە زۆر جار
دەستەو چینی گەلانی تر
یەکیان دەگرت
تێدەکۆشان
بۆ سەرفیرازیی میللەت و
بۆ سەر بە خۆیی نیشتمان
ڕادەپەڕین
شۆڕشێکیان بەرپا دەکرد

داگیر کەریان دەبەزاند و
دوژمنانیان ڕیسوا دەکرد
سەردەکەوتن
لە نێو عالەم دەردەکەوتن!!
**
بەڵام تەنیا میللەتی کورد
نەمدی جارێك
هەموو هێزی
پارت و چین و دەستەیەکی
بە دڵ و بە گیان یەکتر بگرن
یا ورگی دوژمنی بەدکار
بە چەکی یەکبوون هەڵبدڕن
یا لە پێناوی ئامانجیان
بە سەر بەرزیی و مەردی بمرن
گەر وابکەن
خوێنی پاکی شەهیدانیان
هەرگیز ناڕوا
بە بێ هوودە
میللەتی کورد
گەر ئەم ڕێبازە نەگرێ
هەوڵ و خەباتی بێ سوودە!!

# ململانێی حیزبایەتی

هەولێر ١٩٩٥/٢/٨

**

سەردەمێکی چەند ئاڵۆز ە
چەند شێواوە
ئەدگاری ژینی ئەم گەلە
هەموو شتێکی گۆڕاوە
کوردستانمان
یاریگەیەکی گەورەیە و
جێی  پێشبڕکێی سیاسەتە
جێگەی تەفرەو چاو و ڕاوە
یاریەکی تازە بابەت
لە نیو کورد سەری هەڵداوە!!
گەمەی سەیری ململانێی
بیری تەسکی حزبایەتی
یاری کردن بە باوەڕ و
هەست و سۆزی کوردایەتی!!
**
هەر دەستەیەکی هەڵدەستێ
دەڵێ من حزبی پێشڕەوم
گەلێك ڕاست و زانستیە

ڕێگە و بەرنامە و پەیڕەوم
کۆمەڵەیەکی مارکسیم
ڕێکخراوی دروستی
چەوساوە و کڵۆڵ و برسیم
حزبی چینی زەحمەتکێش و
کارگەرانم
پشتیوانی ڕاستەقینەی
ڕەنجدەرانم!!))
**
هەندێ دەڵێن:
(ئێمە حزبی دیموکراتین
دژی بیر و هەڵس و کەوتی
بیرۆکراتین!
جەنگاوەری
ڕێگەی گەیشتنە ئاواتین
فیداکارین
پێشمەرگەی ئاشتی و ئازادین
بۆ میللەتمان
داهێنەری خۆشی و شادین!!))
**
هەندێکی دی، دەڵێن: ((ئێمە حزبێکی پێشکەوتنخوازین
دیموکراتیی سۆسیالیستیی

دوا مۆدێلی سەدەی  بیستین!
ڕێبواری ماندوو و شەکەتی
کاروانی ڕێگەی سەربەستین
ڕیشەکێشی دوژمنانین
ڕزگارکەری کوردستانین
دێنینە دی بۆ گەلی کورد
کۆمەڵگای داد و یەکسانی
ژیانێکی پڕ لە خۆشی و
کامەرانی!!))
**
دەستەیەکی تریش دەڵێن:
((ئێمە حزبێکی ڕابەرین
دڵسۆزی خوا و پێغەمبەرین
موسڵمانین
قورئان یاسا و دەستوورمانە
ڕۆڵەی باوەڕ و ئیمانین
تێکۆشەری بە بێ ڕیاین
حزبی خوداین!!))
**
هەندیکی دی دەڵێن: ((ئێمە
میللەت و وڵات پارێزین
بۆ بەرگری

لە خاکی پاکی نیشتمان
لە سەنگەری
فیداکاری و مەتەریزین
خەبات دەکەین لە پێناوی
ئازادی و سەر بە خۆیی کورد
گیانی خۆمان بەخت دەکەین
بۆ دوژمنان نابین بە پرد!!))
**
دەستەیەکی دیکەش دەڵێن:
((نوێ خوازین،
مافی مرۆڤ دەپارێزین
دوژمنی ئاشووب و شەڕین
ئاشتیخوازین!!))
**
هەمووش دەڵێن:
((ئێمە کوردین
جەنگاوەری ئازا و مەردین
خەباتگێڕی قارەمانی
یەك مەیدان و یەك نەبەردین
لە ڕێبازی کاروانی ژین
بە تەبایی
دەبێ وەکو برا بژین!!))

**

کەچی هەندێ لەو حزبانە
دەستەیەکن
پڕن لە کەسی شەڕ خواز و
گێرە شێوێن
هەڵپەرست و هەڵخەڵەتێن!!
بە کرداری چەوتو درۆ
گەلی خۆیان کرد دەسخەرۆ
بوون بە ئاگر
بۆ سووتاندنی خەرمانی
گەنج و رەنجی میللەتی کورد
بوون بە دز و چەتە و ڕێگر

**

ئەمەیە شارای دروێنەی
کارەساتی ماڵوێرانی
ئاکامی گەمەی دۆڕاوی
سیاسەتیبێ ویژدانی
ئەمەیە ئەنجامی گەمەی
ململانێی بیری تەسکی
حزبایەتی
دوژمنە گەورەی باوەڕی
بەرز و پاکی کوردایەتی!!

## شەڕی حزبایەتی

هەولێر ١٩٩٥/١/٢٣

**

ئاگری شەڕی
ململانێی حزبایەتی
لە کوردستانی ئازاد دا
بەربووە گیانی کوردایەتی!!
تەڕ و وشکی ئەم وڵاتەی
بە کڵپەیەك هەموو سووتاند
دەنگی دیموکراسیی کپ کرد
هەناسەی ئازادی خنکاند!!

**

بۆ وەستاندنی ئەو شەڕە
دەستەی هێزە خێرخوازەکان
لە پێناوی ئاسایشدا
بە دڵسۆزیی کەوتنە نێوان
هیزی شەڕێ زلهێزەکان

**

سەدان زاناو شێخ و مەلا
دەستەو دوعا
کەوتنە تکا

بۆ وەستاندنی خوێن ڕشتن
بۆ ڕاگرتنی خۆ کوشتن
**

پەرلەمانتاری سەوز و زەرد
بە دڵێکی ساف و بێ گەرد
بێ جیاوازیی
لە بۆ چوون لە هەڵوێستا
زوو یەکیان گرت
بۆ ئاسایش
لە ناو تەلاری پەرلەمان
بە پانایان گرت
**

نووسەرو شاعیران هەموو
بۆ بەرقەرار بوونی ئاشتی
بەرهەمی بیرو بڕوایان
داگیرساند و کرد بە سووتوو
هونەرمەند و نووسەرانیش
لە پێناوی ئاسایش و تەبایی دا
لە شاری منارە و قەڵا
بە باوەڕێکی پتەوی وەکو پۆڵا
ویستیان خۆیان بسووتێنن
کەچی هەر گوێشیان پێ نەدان

خەونی ئاشتی نەهاتەدی!

**

تا وای لێهات
لە گشت لایەکی کوردستان
لە وڵاتی نزیك و دوور
لە هەندەران
هەر لە دژی
شەڕ و کوشتاری کورد کوژی
زەنگی خەتەرناك لێدرا
پرۆتستۆی ناڕەزایی
پێشکەش کرا
هاواری تا ساوی گەرم
لە دەروونی میللەت هەستا
کەچی هێشتا شەڕ نەوەستا
تاکو دۆستە زلهێزەکان
کەوتنە نێوان
بە پێی پەیمانی واشنتۆن
شەڕی پیسی براکوژی
بن بڕ کرا
هەموو لایەك بوون بە برا!

# دێ و نایە!!

١٩٩٥/١/٣٠

هـــــــەموو ڕۆژێ بـــــــەڵێن دەدا
کـــە شـــەو دێـــت و کـــەچی نایـــە

شـــای جوانانـــــە لـــــە دنیـــادا
نـــــازدارێکی بـــــێ هاوتایـــــە

کـــــوڵمی ئـــــاڵی گـــــوڵی گەشـــــە
گـــــەردنی ســـــپی مینایـــــە

بـــــالآی نـــــەمامی تازەیـــــە
جـــــوانترین بـــــەژن و بالآیـــــە

زوڵفـــــی پـــــەخش و پەرێشـــــانی
گیابەنـــــد و خـــــاو و بێزایـــــە!

تریقـــــــەی پێکەنینەکـــــــەی
ئـــــــاوازێکی مۆســـــــیقایە

لەوانەی عەشق و دڵداری
گەلێك زیرەك و زانایە**!**

خۆشم دەوێ بە قەد گیانم
بە قەدەر هەموو دنیایە

گیانم بەندە بە بوونی ئەو
دڵم لە ناو دڵی دایە

دەژیم ئەگەر بڵێن دێت و
دەمرم ئەگەر بڵێن نایە**!!**

هەولێر ١٩٩٥/١/٣٠

١٩٩٩/١٠/٢٨

## شنۆ

باخچەی ساوایانی شنۆ
پاك و ڕووناكە وەك ئاسۆ

ئاسۆی خوێندەواری و زانین
ڕێگە و ڕێبازی ڕاستی ژین

ژینی خۆشی و بەختیاری
دوور لە ناخۆشی و خەمباری

با پەردەی خەمباری لادەین
پەستی و خەفەتمان بە با دەدەین

ڕوو بکەینە مەیدانی ژیان
دەست کەین بە هەوڵ و تێکۆشان

کوردستانمان با ئاوا کەین
میللەتی کوردمان بالا کەین

## سروودی ئەنفال

هەولێر ١٩٨٨

**

هەستی شێواوم ، بۆ پەریزادەی
ئەنفال کراوم
بۆ چارە نووسی ، تارو نادیاری
هەزاران لاوم
هاوارە هاوار ، ئازیزان هاوار
وا کورد قڕانە ، بەدەستی زۆردار

بە دەستی دێوی ، بە عسی فاشستی
دۆستی بەدکاریی ، دوژمنی ڕاستی

بەڵام با دوژمن زۆر چاك بزانی
کورد نابڕێتەوە ، وا بە ئاسانی!

ڕەگی ڕژێمی فاشی دەردێنی
تۆڵەی شەهید و ئەنفال کراوان
لە تاوانکاران ، بێ شك دەستێنێ!!
وڵات دەکاتە بنکەی ئازادی
هەتا کورد بژی بەخۆشی و شادی

# دوا شیعری شارەزا

**بۆ گیانی پاکی (خێریە عبدالرحمن) جەلیزادەی هاوسەرم کە لە ٢٠١٣/٣/١٠ کۆچی دوایی کرد**

هیچ گوڵێك نییە، لە باخی ژیان، هەتا سەر گەش بێ
ڕۆژێ دێ بە بای ئەجەل هەڵوەرێ، وەك دڵم ڕەش بێ

ئەوەی تا دوێنێ، هەوێنی شادی و مایەی ژینم بوو
ئەمڕۆ کۆچی کرد، لە جێگەی شادی، خەم و شینم بوو

ئاشق و شەیدا و هۆگری یەکبووین، وەك بولبول و گوڵ
لە لێکدابڕان، خەمێکی قووڵم هاتۆتە ناو دڵ

لە خەم و تاڵی کۆچی ناوەختی ئەم شۆخ و شەنگە
شەو و ڕۆژ دڵم پەست و غەمگین و تاریك و تەنگە!

دەنگو دووی هەردەم لە ناو گوێچکەمدا دەزرنگێتەوە
ڕۆژانی ژینی خۆشی و ناخۆشیم بیر دێنێتەوە

لە کێشەی ژیان هەردەم پاڵپشت و ڕاوێژکارم بوو
خەم ڕەوێنەوەی کێشەی خەمناکی ڕۆژگارم بوو

(خێریە)ی خێر خوازی پاك و بێگەردی ئەم ژینە تاڵە
بە مەرگی ناوەخت ئێمەی وا خستە گریان و ناڵە!!

هەولێر ٢٠١٣/٣/٢١

## پڕۆفایل:



- ناوی تەواوی کەریم کوڕی مستەفا کوڕی حەماغای حەوێزی یە.
- لە ڕۆژی ١٩٢٨/٣/٤ دا لە گەڕەکی هەواو لەکۆیە، شاری ئەدەب و هونەرو خەباتی کوردایەتی لە دایکبووە.
- لە بنەماڵەیەکی زانست و ئەدەب پەروەری هۆشیار پەروەردە بووە.
- لەساڵی ١٩٣٥ دا چۆتە بەر خوێندنی فەرمی لە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی کۆیە و ئەو قۆناغەو قۆناغی خوێندنی ناوەندیی لە ساڵی ١٩٤٦دا هەر لە کۆیە تەواو کردووە.
- لەپاییزی ساڵی ١٩٤٦ دا چۆتە بەغدا لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ئەعزەمیە وەرگیراوە و لەسەرەتای هاوینی ١٩٥٠ یشدا خوێندنی تەواو کردووە.
- لە ١٩٥٠/١٠/٩دا بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی کۆیە دامەزراوە و وانەکانی زمانی عەرەبی وکوردی گوتووتەوە.

- بەشداری یەكی كارای هەبووە لە هەردوو كۆنگرەی یەكێتی ماMۆستایانی كوردستان لە شەقلاوە لە ساڵانی (١٩٥٩ – ١٩٦٠)
- دوای ١١ ساڵ خزمەتی پەروەردە و فێركردن لەسەر هەڵوێستی سیاسی گوێزراوەتەوە بۆ پارێزگای (زیقار)= ناسریە و لە گوندێكی نزیك قزای شەترە كراوە بە مامۆستای زمانی عەرەبی.
- لە ١٩٦٤/١٢/٧دا تەنسیب كراوە بۆ ئامادەیی شەترە بۆ ووتنەوەی زمانی عەرەبی.
- لە پاییزی ١٩٦٦دا گوێزراوەتەوە بۆ پارێزگای هەولێر و دوو ساڵ لە مەخموور، مامۆستای قوتابخانەی قەراجی سەرەتایی بووە.
- لە پاییزی ١٩٦٨دا گوێزراوەتەوە بۆ شاری هەولێر و لە قوتابخانەی یەكەمی هەولێری نموونەیی كراوە بە مامۆستای كوردی و عەرەبی.
- لە دوای ڕێككەتنامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دا كراوە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی (كۆڕەك)ی سەرەتایی كوڕان لە شاری هەولێر.
- لە ١٩٧١/٨/٣١دا گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی هەڵگوردی سەرەتایی كوڕان كە خوێندن تێیدا بە عەرەبی بووە و ئەمیش بە فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر خوێندنەكەی كردووە بە كوردی.

- دوای ٢٠ سـاڵ مامۆسـتایی ١٢ سـاڵیش بەڕێوەبەرایـەتی قوتابخانە خۆی خانەنشین کردووە.
- لـە ساڵێ ١٩٧٣ دا بـە ئەندامی یاریدەدەری کۆڕی زانیاری کورد هەڵبژێردراوە.
- لە شوباتی ١٩٧٠ دا لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد بووەتە ئەندام لەو ڕێکخراوە ئەدەبیەی کورد.
- لـە دەستەی دامەزرێنـەری یـەکێتی نووسـەرانی کـورد، لقـی هەولێر بووە کە لە ڕۆژی ١٩٧٠/١٢/٣ دا دامەزراوەو مۆڵـەتی لە پارێزگا وەرگرتووە.
- لـە کۆنفرانسـی یەکـەمی یـەکێتی نووسـەرانی کـورد، لقـی هەولێر، بە سکرتێری دەستەی بەڕێوەبەر هەڵبژێردراوە و لە سالانی ١٩٧٨ تاکو ١٩٨٣ دا دوو جار بـە سـەرۆکی یـەکێتی نووسەرانی کورد، لقی هەولێر دەرچووە.
- لەهـەموو کـۆنگرەو سـیمینار و میهرەجانـەکانی یـەکێتی نووسەران بەشداری کردووە و جێی پەنجەی دیار بووە.
- لـە پـاییزی ١٩٩٣ دا کـاری وەرگێـڕی یاسـا و بڕیارەکـانی پەرلەمانی کوردستانی کردووە تا کۆتایی ساڵی ٢٠١٣.
- لە ٢٠١٥/٥/٢٣ لە هەولێر کۆچی دوایـی کـردوە و تـەرمەکـەی لە گۆڕستانی دەروێش خدری شاری کۆیە بەخاك سپێردراوە.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی کەریم شارەزا

- ئازادی و ژیان، دیوانی شیعر، بەغدا، ١٩٦٠.
- کۆیەو شاعیرانی (بەرگی یەکەم)، لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٦١.
- ڕێگەی دوور، دیوانی شیعر، نەجەف، ١٩٧١.
- گفتوگۆیەکی ئەدەبی هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٣.
- ئەسیری، بە هاوبەش لەگەڵ جەبار جەباریدا، هەولێر، ١٩٧٤.
- پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦.
- لە یادی گیوی موکریانیدا، ئامادەکردن، هەولێر، ١٩٧٨.
- سێوەی هونەرمەندی کورد، لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٨٢.
- پەندی بەر وردکاری، لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٨٢.
- چەپکێك لە شیعرەکانی سامی عەودال، بەغدا، ١٩٨٣.
- نالی و زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٨٤.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی بەهاوبەشی لەگەڵ سەردار حەمید میران، بەغدا، ١٩٨٦.
- ناودارانی جیهان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- ئەفسانە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، هەولێر، ٢٠٠٧.

- کۆیە لە ڕەوتی شارستانیەتدا بەهاوکاری حاکم نازم حەوێزی- مەجید ئاسنگەر- مستەفا خۆشناو، هەولێر، ٢٠٠٩.
- مەلا ئەسعەدی مەقامبێژی کوردو لەگەڵ حاجی قادر، کۆیە، ٢٠١١.
- کۆیە و شاعیرانی بەرگی دووەم ٢٠١٣ (سەنتەری لێکۆڵینەوە و پەخشی کۆیە).

جگە لە بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییە چاپککراکانیشی (٩) کتێبی قوتابخانەی قۆناغی سەرەتایی و ناوەند و ئامادەیی لەگەڵ مامۆستای پسپۆڕ داناوە یا وەرگێڕاوە و بە چاپ گەیشتووە.

کۆمەڵێك بەرهەمی دیکەیشی بە دەست نووسی ماونەتەوە و چاوەڕوانی چاپ و بڵاو کردنەوەن لەوانە:-

١ -مع أعلام الكورد ( باللغة العربية) مجلد واحد.

٢ -لەگەڵ ناودارانی کورد، (بەزمانی کوردی) مجلد واحد.

٣ -مشاهير العالم، ناودارانی جیهان، (بە زمانی کوردی) مجلد واحد.

٤ -وێنەی شیعریی لەلای شاعیرانی کورد دا.

٥ -دیاردە دژ بە یەکەکەکان و ڕەنگدانەوەیان لە پەند و ئیدۆمی کوردیدا.

٦ -بە سەدان لێکۆڵینەوە و وتاریشی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکاندا بڵاو کردۆتەوە.

چاوەڕوانی لە چاپدانی (بیرەوەریەکانی کاروانی ژیانم بن)

(بنەماڵەی کەریم شارەزا)

## پێڕست



ئەگەر بڵێن
باوەڕ دەکەی نیشانی کورد
ڕۆژێکە دایک و دروست بکا
ماڵی دەسکرد
دەتوانن لە ئەستێرەکانی ئاسمانا
بێ و بچن و بنیات بنێن
شەقام و پرد
بنێرن بە ناو
گوڵزارەکان گەڕەڕووتا
بهێنن بۆمان
خۆشییەی هەزاران بیرەوەر
دەڵێم ، ڕاستە باوەڕ دەکەم
کورد زیندووە و باوەڕم کرد
بەڵام هەرگیز
باوەڕ ناکەم
ئەگەر بڵێن خۆشەویستیی
کوردستانە
لە دڵدا مرد !!

